# ((پوختەی مەنهەجی مسوڵمان))

بەشێکی بڕیاری سیاسی ئیجتهادە ، مەرج نیە ئەوەی بڕیاری سیاسی مسوڵمانانی لەدەستە هەمووجار بپێکێ ، عمر ڕەزای خودای لێبێت خالدی کوڕی وەلیدی لادا لەبەر ئەوەی نەوەک ڕۆژێک خالد (تفرد) بکا ... پاش ماوەیەک معاویەی هەڵبژارد بۆ والی شام بەڵام لەکۆتاییەکەی معاویە (تفرد)ی کرد خیلافەی گۆڕی بۆ مولک ... کەواتە لەکاتی نەپێکان شێلو مەبە صەبر بگرە.

تێبینی

ناونیشانەکە (پوختەی مەنهەجی موسڵمانە) لێت تێکەڵ نەبێ لەگەڵ ( مەنهەجی ئیسلام )

ـ بەشێکی ئەم نوسینەنانە هەڵچنراوی واقعی ئێستای جیهانیە دەکرێ بۆ واقعێکی دیکەی جیهانی نەگونجێ

نوسینی / نزارحاجی

2018/2019

## ((((پێشەکی

بەناوی پەروەردگاری بەرز ، صەڵاوات لەسەر پێغەمبەرمان

صلى الله عليه وسلم

**...**خودایە هیدایەتمان بدەی بۆ ئەوەی ڕوونتر ببینین هێزمان پێ ببەخشی بۆ ئەوەی بەردەوام بین

ئەم کتێبە داڕشتنێکی تەحلیلیە بۆ هەندێ چەمکی ئیسلامی و هەندێ چەمکی سەردەمی ، بابەتەکان لەسەر شێوەی معادەلەیەکە بۆ دەرخستنی ئەنجام دوور لە نوسینێکی تەقلیدی مەقەلایی ... مەبەستم لەدیاری کردنی ئەم چەمکانە (چەمکە دینیەکان و چەمکە سەردەمیەکان) ئەوەیە کە ئەم ڕۆژگارە پڕ بووە لە تەفسیری جیا بۆ بەلاڕێدابردنی ئەصڵی بابەت (خلیسکاندن لەسەر عەقیدە ، خلیسکاندن لەسەر هەندێ ڕوداوی مێژویی و هەنوکەیی) بۆیە بەچاکم زانی لەسەر شێوەی پاوەر پۆینت بابەتەکان بدەمە دەستی خوێنەر بۆ ئەوەی ناخی مەبەستەکە وەک خۆی بێ زیادو کەم بگەیەنم

کورتترین شێوەم لەنوسینەکان هەڵبژاردیە خستومەتە سەر شێوەیەکی نزیک لە مەتن تاکو تەرکیزی خوێنەر وەک خوێندکارێک بخەمە سەر پرسیارە گرنگەکان ... ئامانجی نوسینم لەم نامیلکەیە پێگەیاندن و ئاراستەکردنی تاکی مسوڵمانە لەبەرانبەر ڕووداوەکان و ئەرکی سەرشان

لەم کتێبە مەبەستمە فکرەی تاک بخەمەوە سەر خاڵی سەرەتا دوای ئەوەی بەو هێرشە ئعلامیەی کراوەتە سەر فکرەی تاکی مسوڵمان بۆ پەرت کردنی تەرکیز بۆیە کاتێ ئەم کتێبە دەخوێنیەوە بەچاوی نەقد مەیخوێنەوە چونکە من مەبەستم ئەمە نیە ئەم کتێبە لەقالبی مونافەسەو لەتای هەڵسەنگاندنی بدەم ، مەبەستم ئەمە نیە ئاخۆ چەندە کتێبێکی بەنرخ دەبێ لە دەلاقی کتێبخانە بەڵکو وەک مەدرەسەیەک کۆمەڵێک لە (نص و متن)م لەچوارچێوەی نوسینێکی کورت داڕشتیە بۆ گەیاندنی بۆچونەکانم ((وای دەبینم بۆچونەکانم لەسەر ئەساسی قوڕئان و سوننەتە

کەواتە من لەم کتێبە مەبەستم گەیاندنی مەنهەجێکی فکری عەقائدی ستراتیجیە

# ((بەشی یەك))

## پوحتەی یەک

## تێگەیشتن چیە

تێگەیشتن بریتیە لەو هەستەی چاک و خراپ لەیەک جیا دەکاتەوە

تێگەیشتن لەسەر دوو ڕوکن بینا دەکرێ

یەکەم زانین

دووەم ئینصاف

زانین لە دیراسە و موتابەعە دروست دەبێ

ئینصاف لە ئەخڵاق دروست دەبێ

مەبدەء بریتیە لەدین ، جحود : بریتیە لە زانین بەلام بەبێ ئینصاف ، زۆری کافرەکان جحودیان هەیە (وجحدو بها واستیقنتها انفسهم ظلما وعلوا)

ئێستاکێ لەدونیا گشت دینەکان خاڵین لە بنەما بەڵکو دینەکان شێوەیەکی لاستیکیان هەیە ڕاکێشان و شلکەی لەدەست ڕابەرەکانیانە ، کەواتە ئەوەی تێگەیشتن دروست دەکا بریتیە لە بنەمای ئەخلاقی و زانین

دینداری بریتیە لە (ئەخلاق ، عەقیدە ، ترس و ئومێد بۆ حودا)

هیچ دینێک کامل نیە لەبنەماکانی (ئەخلاق و عەقیدە و ترس و ئومێد) تەنها دینی ئیسلام نەبێ .

.

## -:پوختەی دوو

### دین بریتیە لە دەق

دەق بۆ ئەوەیە پابەند بیت پێی هەندێ لە دەقەکان عەقڵ دەرکی دەکا هەندێکیش لە دەقەکان عەقڵ تەفسیری نیە بۆی واتا دین لەچوارچێوەی (سمع و طاعة)یە ، خودای گەورە عەقڵی ئینسانی دروست کردووە ، هەندی لە ئینسانەکان دیانهەوێ بەو عەقڵە دروست کراوەیان نەقدی بەرنامەی دروستکەری عەقڵەکەیان بکەن !؟ دین علم نیە (مەبەستم لە علم ، علمی ئینسانە کە خودای گەورە بەشێکی بچوکی بەخشیوە بەئینسان) بەڵکو مەجموعەیەک پرۆگرامە خودای گەورە دایرشتووە بۆ ئیمەمانان بۆیە ئیطاعە و خضوع لەدین واردە ... پێغەمبەر دەفەرموێ (هلک المتنطعون) لەناو دەچن ئەوانەی زۆر لەشت دەکۆڵنەوە ، ئیمام علي دەفەرموی (لو كان الدين بالرأي لكان اسفل الخف اولى بالمسح من اعله)

ئەگەر دین بەڕەئی بوایە لەکاتی مەسح بۆ دەستنوێژ ژێرەوەی خوف ئەولاتر بوو بەسەرەوەی . ) کەواتە ڕەئی تۆ بەرانبەر دەقەکانی دین تەنها ئیشتباهێکە شەیطان دروستی کردووە لەناخت ، ئەگەر بەردەوام بیت لەسەری ئەوا دەچیە ریزی ئەوانەی خودای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ (فأما الذين في قلوبهم زيغ فيتبعون ما تشابه منه ابتغاء الفتنة وابتغاء تأويله وما يعلم تأويله إلا الله ) ئەوانەی نەخۆشی لە دڵەکانیان هەیە بەردەوام شوێن ئەو وشەو جوملانە دەکەون کەتەنها خودا مانای کۆتاییەکەی دەزانێت ... کەواتە ئەصڵ لە ئیمان بریتیە لە تەسلیم بونی بێ چونوچەرا بە دەقەکانی قورئان و حەدیسی صەحیح ، ئەگەر هاتو دەقێک لەگەڵ عەقڵت تەعاروزی کرد بزانە ئەوە وەسوەسەی شەیطانە دەیهەوێ لەم ڕێگایە بتخلیسکێنێ چونکە هیچ کات عەقڵی ئینسان ناتوانی نەقدی دەق قورئان و حەدیسی صەحیح بکا

## -:پوختەی سێ

جیاوازی نێوان دەعوەو مەوعیزە

دەعوە ( بانگەواز)/ بانگەواز واتا بانگ کردنی خەڵک بۆ سەر ڕێبازێکی دیاریکراو ، دەعوە چرپاندنی وشەگەلێکی نوێیە بەگوێی بەرانبەر ،

مەوعیزە واتا وەبیرهێنانەوە / وەبیرهێنانەوە واتا باگاکردنەوە لە ساردبونەوە و لەبیرچوون, مەوعیزە دووبارە کردنەوەی وشەگەلێکە بەگوێی پابەندبوان بۆ نمونە / پێغەمبەران سەرەتا دەعوەیان کردیە دواتر مەوعیزە ، دەعوە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی بەرانبەر بۆ پابەند کردن ، دواتر مەوعیزە بۆ دامەزراو کردنی پابەندبووەکان . خودای گەورە دەفترموێ (فتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَا أَنْتَ بِمَلُومٍ * وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِين

فتول عنهم (واتا وازیان لێبێنە لەدەعوە ، چونکە ئەوان ئیتر پابەند نابن ) ، وذکر ( بریتیە لە ( مەوعیزە ، واتا ئەوانەی پابەند بوون ئەوان دەمەزراو بکە لەسەر ڕێبازەکە

دەعوە لەئیسلام واتا بانگەواز بۆ یەک خوا پەرستی ، یەک خوا پەرستی (الوحدانیە) واتا دوور کەوتنەوە لە شیرک )

شیرک دوو جۆرە /

یەک / شیرک لە پەرستن ( اعبدالله ولاتشرک به شیئا )

دوو / شیرک لەفەرمانڕەوایی ( ان الحکم الا لله )

کەواتە باس کردنی جوزئیاتی دین بۆ دینداران بریتیە لە مەوعیزە ، بانگ کردن بۆ یەک خواپەرستی واتا دەعوە .

## پوختەی چار

### زانست و نەزەریە و فەلسەفە

زانست بریتیە لە بەرچاو کەوتن و بەردەسەت کەوتنی مادده (واتا بریتیە لەسەلماندنی پێکهاتەی مادده) بۆ نمونە (خۆر تەنێکە لەئاسمان لەبەر چاومانە بەڵام زاست نیە ؟ تەنها زانینە واتا دەزانین ئەو تەنە مەوجودە بەلام نازانین پێکهاتەی خۆر چیە ؟ کەواتە بۆیە زانست نیە چونکە لەبەر دەستمان نیە .

نەزەڕیە بریتیە لە ڕوانگە (واتا بۆچونێکە دەربارەی مەجهولێک کەهێشتا نەبینراوە یاخود بینراوە بەلام دوورە دەستە ) ،

فەلسەفە بریتیە لە هەستێک کە لەئاواتەوە سەرچاوەی گرتوە (التأمل) ،

چوار مەرحلەی هەی ;

١. فکرە

٢. بەدواگەرانی ئەو فکرەیە لە واقع

٣. گەیشتنی فکرە بۆ مەرحلەی نەزەڕیە

٤. سەلماندمی نەزەڕیە بۆ بەرچاو کەوتن و بەردەست کەوتن (زانست)

نەزەڕیە مەرحەلەیەکە لە زانست ، بەلام فەلسەفە پەیوەندی بەزانست نیە ... دین بریتیە لە فەلسەفە (واتا دین پەیوەندی بە نەزەڕیە و زانست نیە) کۆی دینەکانی دونیا بریتین لە فەلسەفە ، فەلسەفە لە شەش بنەما هەڵدەقوڵێ (حکمە ، عقل ، قیەم ، زمان ، حکم ، عبادە ، هێز) هەرکاتێ ئەم چەمکانە لەواقعێک پێکەوە کۆبونەوە ئەوا شارستانیەت دروست دەکەن ...

دین بەزانست ناسەلمێنرێ ؟ ئەمە هەڵەیەکە زۆرێک لەمسولمانان گیرۆدەی بوون کە دەیانهەوێ قورئان بسەلمێنن بە دۆزراوە زانستیەکانی ڕۆژئاوا بۆ نمونە خودای گەورە دەفەرموێ

پێمان نیشانداون تاکو تەماشا **(** سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق **)** بکەن لەو نیشانانەی لەسەر سەریانە (مەبەست لێ ئاسمان و ئەستێرەکانە) وە نیشانە لە لەشی خۆیان ... تاکو بۆیان دەربکەوێ کە خودا حەقە . پێش ١٤٠٠ ساڵ لەوجودی دەعوەی دینی ئیسلام ئەگەر زیاتر دوور بڕۆین بگەڕێینەوە سەردەمی پێغەمبەرانی پێشوتر لە زەمەنی ئەواندا زانستی پزیشکی وجودی نەبووە تاکو لەڕووی پێکهاتە زانستیەکەی لاشەی ئینسان مسولمانانی ئەوکات گەیشتبنە دانیان بەحەقانیەتی خودا ؟ ... لەئێستادا بەشی زانستی پزیشکیمان هەیە بەلام بەشی زانستی فەلەکیمان کامل نیە چونکە هەر قسەیەک دەربارەی فەلەک (فوق) دەکرێ نەزەڕیەیە نەک زانست واتا نەگەیشتۆتە مەرحەلەی زانست (هەروەک نموونەمان بەخۆر هیناوە لە نەزەڕیە)

دین زانست نیە تاکو بسەلمێنرێ ، بەلکو بە عەقڵ دەسەلمێنرێ ، عەقڵ بریتیە لە تێگەشتن (لەبابەتی پێشو باسی تێگەشتنم کردیە کە دوو بنەمای هەیە"""یەکەم زانین ، دووەم ئینصاف"""" واتا تەنها پەیوەندی بە بینین هەیە کەواتە پێکهاتەی ئەم کەونە و ئەوەی تێیدایە **((((**سنريهم

لەزانستی ئینسان زۆر گەورەترە وە خودای گەورە بەشێکی بچوک لەزانستی بە ئینسان داوە (وما اوتیتم من العلم الا قلیلا) ،

بۆیە گشت تاکێک بەپێی زانین بەپرسیارە بەرانمبەر خودا نەک بەپێی زانست چونکە هەموو تاکێک چاوی هەیە بۆ ئەوەی ببینێ وەعەقڵی هەیە بۆ ئەوە بڕیار بدا لەسەر ئەو حەقانیەتە ... بۆ نمونە کاتێ ئینسانێکی نابینا دان بەحەقانیەتی خودا دەنێ لەکاتێ نابینێت ؟ ئەم کەسە نابینایە داعی وەصفی بینراوەکانی بۆ دەکا ، کابرای نابیناش عەقڵی هەیە دەرکی دەکا وە ئینصافی هەیە دان دەنێ بەحەق کەواتە زانست پەیوەندی نیە بەدین چونکە لەهەموو زەمەنێک زانست مەوجود نیە ، وەلەهەموو زەمەنێک زانست ناتوانێت گشت ڕووداو و تەنەکانی دەوروبەر بسەلمێنێ وە خودای گەورە بەشێکی بچوکی لەزانست بەئینسان داوە بۆیە هەندێ بابەت هەن لەدەوروبەر قەتاوقەت زانستی ئینسان ناگاتە ئەو ئاستەی بیسەلمێنێ

## -:پوختەی بێنج

عەقڵی ئێستاو عەقڵی کۆن لە مەجالی فەلسەفە

دوو جۆر زانستمان هەیە زانستی ماددی (واتا دروستکراوەکان) وەزانستی مەعریفی(فەلسەفی) واتا ووتەو نوسینەکان

دروست کراوە ماددیەکان دوو جۆرن/

دروستکراوێک کەڕاستەوخۆ دەستکردی خودایە مرۆڤ پەیوەندی پێوەی نیە

دروستکراوێکی زهنی/ ئەمەیان واتا خودای گەورە مرۆڤەکان فێری دروستکردنی شتێک دەکا واتا ئەگەر خودای گەورە فکرەی دروستکردنی شتێک بەمرۆڤ نەدا ئەوکاتە هەموو گرۆی ئادەمیزاد کۆببنەوە ناتوانن ئەنگوستیلەیەک دروست بکەن .

ئەوانەی دەڵێن زانستی مرۆڤ بەپێی تطوری کات زیاد دەبێ ئەمانە نازانن جۆرەکانی زانست چیە لەبەر ئەوە قسەیەکی سەرپێی دەکەن کە لەقاموسی عەقڵ جێی نابێتەوە . بەپێی تێپەڕبوونی کات کە ژمارەی مرۆڤەکان زیاتر دەبن ڕوقعەی ژیان فراوانتر دەبێ داواکاریەکان ڕوو لەزیادبوون دەکەن ، زانستی ماددی بەشی زهنیەکەی کەپەیوەندی بەمرۆڤ هەیە لەو بەشە خودای گەورە مرۆڤەکان فێر دەکا ئەو شتانە دروست بکەن کەبۆ ژیانیان پێویست و زەڕورن ، لەم بەشەیان تەطوری عەقلی ڕودەدا ، واتا مرۆڤەکانی ئێستا دەتوانن شتانێک دروست بکەن هی پێشتر نەیان توانیوە . بەڵام بەشە مەعریفیەکەی(فەلسەفیەکەی) جیاوازە مرۆڤەکانی پێشتر بەتواناتر بوون لەنوسین و دارشتن و وتارو وتە ، بۆ نمونە ؛ ئایا دەتوانی بڵێی زمانی عەرەبی ئێستا پاراوترو بەهێزترە لەسەردەمی جاهلی ، ئایا دەتوانی بڵێی شاعیرانی ئێستای عەرەب بەتواناترن لەشاعیرانی جاهیلی ، ئایا دەتوانی بڵێی شاعیرانی ئێستای کورد بەتواناترن لەشاعیرانی کۆن (کلاسیک) ، بچەینەوە پێشتر ئایا کەسانێکمان لەو سەردەمە هەیە وەکو (ابن سیرین وە ابن خلکان وە ابن خلدون ... کەواتە لەبەشە مەعریفیەکەی (فەلسەفە) مرۆڤی ئێستا تەفسیرو شەرحی مەعریفەتی کەسەکانی پێشتر دەکەن

**-:پوختەی شەش**

تەفسیر و ڕەئی دین لە کێ وەربگرین

فإن کنت في شئ مما انزلنا الیک فاسأل الذین یقرءون الکتاب من قبلک لقد جائک الحق من ربک خودای گەورە دەفەرموێ ( فلا تکونن من الممترین

فکرەیەک پەیدا بووە دەیانهەوێ لەپێشینان (سلف) بدەن لەکاتێ پێشینان سەرچاوەی گەیاندنی بنەماکانن لەسەر ئەصلی خۆی ، واتا هەرکاتێ لەپێشینان درا سەرچاوە بزر دەبێ کەسەرچاوە بزر بوو ئەصل نامێنێ

لەم ئایەتە باسی پێنج حالەت دەکا :

یەکەم / شەک ( فان کنت في شك ) ئەگەر گومانت بۆ دروست بوو

دووەم / پرسیار لە سەلەف (فاسأل الذین یقرءون الکتاب من قبلک) لەکاتی گومان ... پرسیار لە پێشینان دەکرێ ، واتا پێشینان (سلف) لەپرسیار کردن ئەصڵە

سێیەم / حق ( لقد جاءك الحق من ربك ) ئەگەر پرسیارت لە سەلەف کرد خودا حەقت بۆ ڕون دەکاتەوە ... بەلام ئەگەر پرسیارت لەپێشینان نەکرد ئەوا توشی حالەتێ دەبی پێی دەوترێ (ممتر)
چوارەم / ممتر (فلا تکونن من الممترین ) /ممتر / ئەوکەسەیە حەق پێ دەزانێ بەلام دانی پێ دانانێت (حاقد) ، یاخود حەق و ناحەق لێ تێکەڵ دەبێ بەهۆی ئەوەی سەرچاوەی پرسیاری هەڵەیە

السلف لە / لغة / واتا پێشین ، پێشینان ، ئەوکەسانەی لەپێش ئێمە ژیاون و مردوون . سەلەف لە /مصطلح / واتا سەرچاوە ، واتا گەڕانەوە بۆ سەرچاوە سەرچاوە / واتا قورئان سوننەت و لێکدانەوەی زانایان

کەواتە لەپێشینان پێغەمبەر پیرۆزە لەدوای پێغەمبەر کەس پیرۆز نیە هەر کەسێکی تر بەپێی سەعیو کردەوەی نسبەی رێزی هەیە . پێغەمبەر بەهۆی کەفالەتی خودا بۆی پیرۆزە صەحابە بەهۆی کەفالەتی پێغەمبەر بۆیان بەرێزن دوای ئەوە هەر کەسێکی تر بەهۆی سەعیو کردەوەیان رێزیان هەیە .

کەواتە سەلەف بریتیە لەقورئان بەنەگۆرەکانی حەدیسە صەحیحەکان وەلێکدانەوەی زانایانی پێشوو لەسەر گۆراوو شەرحی حەدیسەکان

خودی کەسەکان لەدوای پێغەمبەر قابیلی هەڵەن بەڵام ئەوە ناگەیەنێ کە مقارەنە بکرێن لەگەڵ زانایانی ئەو سەردەمە ، چونکە ئەوان نزیکتر بوون لەسەرچاوە (قوئان ، حەدیس) هەندێک لەو زانایانە لەدەمی صەحابەیان وەرگرتیە هەندێکی تریان لەتابعیان وەرگرتیە ... واتا زۆری ئەو زانایانە دەستی دووەم و سێیەم بوون ، لەبەر ئەوە چۆن دەتوانی مقارەنەی زانایەک بکەی کەلە پێغەمبەرەوە فێربووە یاخود لەصەحابە فێربووە یاخود لەتابعی فێربووە لەگەڵ زانایەک کە هەزار ساڵ دوای ئەوان ژیاوە ! بۆنمونە ؛ کانی واتا سەروچاوەی ئاو ، پاکترین ئاوی هەر کانیەک نزیکترین خاڵی سەرچاوەکەیەتی ، چەند دوورتر بکەویەوە لەسەرچاوەکە ئاوەکە زیاتر خڵتوخاڵ هەڵدەگرێ پیستر دەبێ ، وەئەگەر پیسیش نەبێ یەقین نیە لەسەر پاکیەکەی واتا گومانداره . نزیکترین کەس لەسەرچاوەکە ئاوی پاکی دەست دەکەوێ تا دوور دەکەویەوە لەسەرچاوەی ئاو (کانی) ئاوێکت دەست دەکەوێ کەدڵنیا نیت پاکە یان نا . بۆیە زانایانی پێشوو لە نزیکترین خاڵی سەرچاوەکە زانایان وەرگرتووە ...

کەواتە سەلەف واتا نزیکترین زانیاری لەسەرچاوەی ئەصلەکە . مێژوو بینای ئەمرۆ و بنەمای داهاتووە ، هەر کەسانێ لەمێژوویان دا مەبەستیانە بینا و بنەما بروخێنن بۆیە ڕاو تەفسیری زانایانی سەلەف ئەصڵە لە ئیسلام

# نیەت

النیة نیەت ئەو مەبەستەیە لەناخی ئینسانەکان کە بزرە لەچاو و گوێی بەرانبەر)

نیەت مەرج نیە هەموکات ببیتە بنەمای کار

نیەت پێویستی بە دوو بنەما هەیە تاکو ببیتە بنەمای کار

یەکەم / فهم

دووەم / عدل

بۆیە کاتێ موشریکەکان شیرک ئەنجام دەدەن لەبێ زانیاری دەیانووت (مانعبدهم الا لیقربونا الی الله زلفی)

هەر پێغەمبەرێک هاتووە بۆ گەلێک لەسەر ئەم دوو بنەمایە قسەی بۆ کردوون ; حەقی بۆ ڕوون کردونەتەوە (فهم) ، بۆی روون کردونەتەوە چۆن لایەنە راستەکە هەڵبژێرن (عدل)

بەم دوو بنەمایە دەوترێ ئیقامە حوججە دوای گەیاندنی دوو بنەمای (فەهم و عەدل) ئیتر پێویستە نیەت لەسەر تێگەیشتن ئاراستەی کار بکا وە دادپەروەرانە بریار لەسەر بەشەکانی ژیان بدا ... واتا دەبیتە ئەرک لەسەر نیەت ڕاست و دروستی ژیان هەلبژێرێ ، ئەگەر ڕاستی هەڵنەبژارد ئەوا یان شەیتان فێڵی لێ کردووە (لێرە تاوانبارە چونکە نابێ بەگوێی شەیتان بکا لەبەر ئەوەی بنەمای فەهم و عەدلی پی گەیاندرایە) ، یان نیفاقە کە خۆی نایهەوێ ڕاستی هەلبژێرێ

## -:پوختەی هەشت

### ئیسلام و ئیمان

خودای گەورە دینی ئیسلامی دابەش کردۆتە سەر دوو بەش دەفەرموێ ( قالت الأعراب آمنا قل کابرا وتی ئیماندارم ، خودای گەورە ( لم تؤمنوا ولکن قولوا أسلمنا ولما يدخل الإيمان في قلوبكم فەرمووی پێی بڵێ تۆ ئیماندار نیت بەڵکو تەنها تەسلیم بووی بە ڕوکنەکانی ئیسلام / 1- شەهادە (باسی شەهادە دەکەین) 2- نوێژ کردن ٣- زەکات دان ٤- ڕۆژو گرتن ٥- حەجی ماڵی خودا .
ڕوکنەکانی ئیمان / ١- ئیمان بەخودا 2- ئیمان بەمەلائیکەت ٣- ئیمان بە کتابەکانی خودا ٤- ئیمان بە پێغەمبەران ٥- ئیمان بەڕۆژی دوایی ٦- ئیمان بە بەقەدەری خێر و شەڕ

هەموو ئیماندارێک ئیسلامە بەلام هەموو ئیسلامێک ئیماندار نیە ؟

ئیسلام / واتا جێ بەجێ کردنی ڕوکنەکانی ئیسلام

ئیمان / واتا باوەڕ هێنان بەجێ بەجی کردنی ڕوکنەکانی ئیسلام . ئیمان بریتیە لە کردەوەی دڵ ، واتا ئەگەر ڕوکنەکانی ئیسلامت جێ بەجێ کرد ، بەڵام ئیقراڕی دڵی لەسەر نەبوو تۆ ئیماندار نیت ، ئیقراڕی دڵ چیە ؟ (پێغەمبەر دەفەرموێت " ليس الإيمان بالتمني ولا بالتحلي، ولكن ما وقر في القلب وصدقه العمل" )

واتا کردەوە دەبێ لەسەر ڕەزامەندی دڵ بێت ، ڕەزامەندی دڵ چیە ؟ پێغەمبەر دەفەرمویت (من قال لااله الا الله مخلصا من قلبه دخل الجنة)

مخلصا من قلبه / پیویستی بە (صواب ) هەیە ( صواب واتا بەزانستەوە ) ، زانست : خودای گەورە دەفەرموێ (فاعلم انه لااله الا الله

بزانە "لااله الا الله" چیە ؟ کەواتە جێ بەجی کردنی هەر کردەوەیەک لەئیسلام پێویستی بە دوو ) بنەما هەیە

یەکەم / اخلاص ، نیەت نیەت دەوردەبینێ (لەبابەتی پێشوتر باسی نیەتم کردیە)

دووەم /صواب ، زانست تۆ لەسەرتە بەدوای حەقیقەت بگەڕێی

کەواتە

یەکەم / نەبوونی قەناعەت هەموو جار واتای ئەوە نادا کەتۆ لەسەر حەقیت

دووەم / بوونی قەناعەت هەموو جار مانای ئەوە نادات کەتۆ لەسەر حەقیت بۆیە دەبێ بەدوای حەق بگەڕێی

حەق لە ئیسلام بریتیە لە دەق لەبابەتی پێشوتر باسی دەقم کردیە ، دەبێ لەوجودی دەق ئیقراڕی دڵی لەسەر بکەی "نیەت" لەبابەتی پێشوتر باسی نیەتم کردیە

## -:پوختەی نۆ

### ولاء و براء

ئەم دوو چەمکە سەرەکیترینی بنەمای ئیمانن دوای تەوحید ، هەرچەندە (ولاء و براء) یەکێکن لە ڕوکنەکانی تەوحید ... کاتێ دەوترێ (ولاء و براء) واتا ئەم دوو مانایە دەبێ لەپاڵ یەکتر بەکار بهێنرێن چونکە بونی یەکێکیان بەتەنها تەکمیلەی ئیمان ناکا

ولاء و براء/ ئەگەر بمانهەوێ تەرجومەی حەرفی بۆ بکەین بۆسەر هەر زمانێک مانای دەقیق نادا بۆیە دەبێ بە پێناسە ماناکەی بۆهەر زمانێک ڕون بکەینەوە

ولاء / ئەو خۆشەویستیەیە بۆ بەرانمبەر لەسەر بنەمای هاودینی بەبێ بوونی هیچ بەرژەوەندیەک ،
براء / ئەو ڕقەیە لە بەرامبەر لەسەر بنەمای غەیرە دینی بە بوونی زەڕ لەو بەرانمبەرە یان نەبوونی
زەڕ

ولاء وبراء / ئەو هەستەیە لە تێگەیشتن و پابەند بوون بە بنەماکانی ئیسلام هەڵقوڵایە کە مرۆی
مسوڵمان ئاراستە دەکا بۆ خۆشویستن و ڕق لێبوونەوە ... لەبابەتی پێشوتر باسی (ئیسلام و ئیمان)م
کردیە ... دەکرێ یەکێک بەهۆی کەم تەرخەمیەوە نەپەڕیتەوە دائیرەی ئیمان بەلام (ولاء و براء)
(روکنی هەردوو بەشی دینە ( ئیسلام و ئیمان

## :پوختەی دە

# شەهادە

واقیم الشهادة لله  هەڵسە بە شایەدی دان لەبۆ خودا (وما شهدنا الا بما علمنا) بەپێی تێگەیشتن و زانینی خۆت شایەدی بدە .

تۆ تەکلیف کراوی بەشایەدی دان دەی کەواتە بێ خەم مەبە لەم ئەرکە کەمتەرخەمی تێدا مەکە (ولاتکتمو الشهادة ومن یکتمها فانه اثم قلبه) حەقیقەت بزر نیە زۆرینەی زۆرمان حەق دەناسینەوە بەلام جار وایە لەگەڵ مەصڵەحەت یەک ناگرتەوە بۆیە خراپەکان بەحوجەجە دەکرێ تا دەگاتە ئەو حاڵەتەی ناحەق بەحەق دەزانی ( ومن اظلم ممن کتم شهادة من الله ) کێ لەوە زاڵمترە کە شایەدی بۆ خودا دەشارێتەوە

شەهادە لە شاهێد سەرچاوەی گرتووە دواتر دەبێتە شەهید ، واتا هەرکەسێ حەقانیەتی خودا دەزانێ لە فەرمانڕەوایی و عیبادەت ئەوکاتە موکەلەفە بەشایەدیدان لەسەر ئەو حەقانیەتە .

شهود ، شاهد ، شهید

شهود (بینین یان بیستن

شاهد ( هەڵسان بە شایەدیدان لەسەر حەقیقەتی بینراو یا بیستراو

شهید (بەردەوام بوون لەسەر شایەدیدان ) ، شەهید مەرج نیە کوژراوێک بێت لەپێناو خودا ، زۆرێک جار کەسێک بەپێیەکانی دەڕوا بەڵام دەرەجەی شەهادەتی لەو کەسە گەورەترە کەلەپێناو خودا کوژراوە چونکە (اکبر جهاد عند الله کلمة حق عند سلطان جائر ) شەهید واتا شاهد واتا شەهادە  واتا کاتێ تۆ هەلدەستی بەگەیاندنی حەقانیەتی فەرمانڕەوایی خودا و عیبادەتی خودا .

فەرمانڕەوایی خودا بریتیە لە تەسلیم بوون و ڕازی بوون بە ئەحکامی قورئان ، عیبادەتی خودا بریتیە لە هاناو تەوەکول و ڕەجاو پاڕانەوە تەنها بۆ خودا

## -:پوختەی یازدە

**(گەیاندنی دین(دەعوە**

دەعوە  پێویستی بە چار صیفەت هەیە

یەکەم علم

دووەم تەزکیە

سێیەم جورئەت (عزم )

چوارەم حیکمەت

نوقصانی هەریەکێ لەم صیفەتانە دەبێتە هۆی لاوازی و پەرت و بڵاوی خیطابەکە

علم/ بریتیە لە دیراسەی بەردەوام ، هیچ کات ناگەیتە لوتکەی زانست بۆیە غرور نەتگرێ بەوەی دەیزانی و بنەمای قسەکانت بخە سەر دەلیل

تەزکیە / بریتیە لە پەروەردە کردنی نەفس لەسەر خۆ ڕاگری و لەخۆبوردەیی بۆ خودا

جورئەت / بریتیە لە قسە کردن بەجۆرێ بەشی حەق نەخوا ،

حیکمەت / بریتیە لە گەیاندنی حەق بە مراعاتی کاتو شوێن و کەسەکان

( اقرأ ) دواتر (یاایها المزمل قم اللیل الا قلیلا) دواتر

**(ادعو الی سبیل ربک بالحکمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي احسن)**

دواتر (ادعو الی لله علی بصیرة) دواتر(فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ)

کەواتە حەقانیەتی دین بەزمانێک دەکرێ کە زانست و حیکمەت و تەزکیە و جورئەتی لەسەر بێت ، خودای گەورە دەفەرمووێ( (ربنا وابعث فیهم رسولا منهم یتلو علیهم آیاتك ویعلمهم الكتاب والحكمة ویزكیهم)

## یوختەی دوانزدە:

الاقامة الحجة

اقامة واتا گەیاندن

حجة واتا دەلیلی براوە (الدلیل القاطع

الاقامة الحجة ; گەیاندنی دەلیلی براوە

اقامة حجة) پەیوەندی چیە بە تێگەیشتن ؟ (لەبابەتی پێشوتر باسی تێگەیشتنم کردیە

کە دوو ڕوکنی هەیە :

یەکەم زانین

دووەم ئینصاف

واتا تێگەیشتن لەبەرانبەر (اقامە حجە) بریتیە لە ئەخلاق (مەبەست لەئەخلاق ئەو تەبیعەتە زاتیەیە کە خودای گەورە لەناخی هەر ئینسانێ ڕواندویەتی

ئەو تەبیعەتە زاتیە بریتیە لە فطرەت ، فطرة : واتا توحید (گشت ئینسانی لەسەرەتاوە وەحدانیەتی خودای قەبولە بەلام بەهۆی هەندێ هۆکار بەرەو شیرک هەنگاو دەنێ

تەوحید : واتا ئەو دوو روکنەی تێگەیشتن (زانین ، ئینصاف) بەرانبەر زاتی خودا و بەرنامەی خودا

شیرک ; بریتیە لە بەڕاست زانینی هەر بەرنامەیەک غەیری بەرنامەی خودا (اسلام

شیرک دوو جۆرە /

یەکەم ، شیرک لە مەجالی ئیستعانە و ئیستغاثە و تەوەکول ...

( دووەم ، شیرک لەمەجالی بەرنامە (دین

لەبابەتی دواتر باسی دینم کردیە

شیرک لە بێ خەبەرکردن لەو دوو ڕوکنەی تێگەیشتن (زانین ، ئینصاف) سەرچاوە دەگرێ

اقامة حجە) بریتیە لە گەڕاندنەوەی (فطرە) بۆ ناخی ئەو کەسانەی کە بێ خەبەر کراون (واتا کاتێ داعی ئیقامە حجە دەچرپێنێ بەگوێی کەسێ ئەوا شتێکی نوێ و غەریبی پێ نالێ بەلکو هەول دەدا ئەم کەسە بگەڕێنێتەوە سەر ئەصل کە لێی لاداوە

کەواتە کەسێک کاتێ (اقامە حجە)ی بەرانمبەر دەکرێ ئەوا ئەو کەسە هیچ عوزرێکی بۆ نامێنێتەوە لەبەرانمبەر مەحکەمەی خودا

چونکە داعی شتێکی غەریب ناگەیەنێ بەلکو شتێک دەڵێ کەلەناخی هەر تاکێکدا وجودی هەبوە

ئنصاف واتا قبوڵ کردنی حەق ، زانین بریتی نیە لەزانست بەلکو زانین بریتیە لە لایەنی ئینصاف مەعنەوی ئینسان زانین لەسەر قەناعەت بینا دەکرێ ، جونکە دین زانست نیە تاکو بسەلمێنرێ ، واتا هەر بەرنامەیەک(دین) لەم کەونە وجودی هەبێ بریتی نیە لەزانست بەلکو بریتیە لە مەجموعەیەك تەئەممول

کەواتە تۆ لیرە قەناعەتت بەکام تەئەممول هەیە ئەوە دینی تۆیە) واتا دوای (اقامە حجە) شتێک نامینێتەوە بەناوی نەزانین ، ڕونتر واتا لەمەیدانی مەحشەر لەبەردەم مەحکەمەی خودا نەزانین (((نابیتە عوزر ، تەنها ئەگەر اقامە حجە) نەکرا بیت (((وما کنا معذبین حتی نعث رسولا

## پوختەی سێزدە

### محبة لە شەرع

مانای محبة لە شەرع/ خۆشەوستیەک بنەما لەسەر ڕێبازێک

مانای طاعة لەشەرع / شوێنکەوتنێک بنەما لەسەر خۆشەویستی ڕێبازێک خودای گەورە دەفەرموێ (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّه

ُ

مانای محبة و طاعة لە ئیسلام تەواوکەری یەکترن ، هەردووکیان پێکەوە (عبادة) دروست دەکەن ، واتا هەر گوێڕایەڵیەک(طاعە) لەسەر بنەمای خۆشەویستی(محبە) بێت ئەوا عیبادەتە بۆیە دەبێ گوێڕایەڵی لەسەر بنەمای شەرعی خودا بێت واتا ئەگەر فەرمان پێچەوانەی شەرعی خودا بوو ئەوا گوێڕایەڵی مەعصیەتە ، خودای گەورە دەفەرموێ (وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَاۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا)

دایک و باوک کە خاوەن حەقترینن لەدوای خوداو پێغەمبەر بەڵام نابێ شتێکیان بەگوێ بکەی پێچەوانەی شەرعی خودا بێت.

## :پوختەی چاردە

### سمع و طاعة

سمع و طاعة / واتا گوێ لێبون دواتر ڕاستەوخۆ جێبەجێ کردن

خودای گەورە دەفەرموێ (أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ )

اطيعو الله و اطيعوا الرسول (دووبارە کردنەوەی وشەی *اطيعوا* (لەپێش الله وەلەپێش رسول) واتا پابەند بوون بە قورئان و سوننەت لەپاڵ یەکترە

(دەستێکی موخابەڕاتیە بە کوژاندنەوەی سوننەت بۆ دروست کردنی دینێکی مەطاطی وەک دینی مەسیحی) ، پاشان دەفەرموێ [واولي الامر منكم] لێرە وشەی *اطيعو لەپێش اولي الامر نیە واتا ئەگەر ( اولي الامر ) لەژێر ئیطاعەی خوداو پێغەمبەردا بوون ئەوکاتە ئیطاعە دەکرێن (لا طاعة لمخلوق في معصية خالق)

اولول الامر دوو بەشە /

یەکەم : دەسەڵاتدار

ئیطاعەی دەسەڵات واجبە ئەگەر دەسەڵات ئیطاعەی خواد و پێغەمبەری دەکرد

دووەم : ئیجماعی زانایان لەسەر ڕایەکی فقهی

لەو بەشەیان مەبەستمان زانایانی پێشترە کە کۆڕا بوون لەسەر بابەتێک  بۆ ئێمە بۆتە شەرع ئیطاعەی دەکرێ لە فقە و سیاسە ، بەڵام شەرعیەتی ئیجماعی زانایان لەژێر دەسەڵاتێکی نا ئیسلامی شەرعیەتێکی ناقصە لە فقە ، بەڵام لە ئموری سیاسی شەرعیەتێکی باطڵە.

## پوختەی پازدە:

حوكم لەنێوان دیموكراسی و ئیسلام

(دیموكراسی : واتا دەنگی خەڵک ، ( براوە لەهەڵبژاردن ، پەنجا كۆ یەک ""الاغلبیة

ئیسلام : بریتیە لە گەیاندنی بەرنامەی خودای جیهان بۆ ئادەمیزاد لەلایەن نێردراو محمد

حكم : واتا مەجموعەیەک بنەما بۆ تەنزیم كردنی كۆمەڵگا

لەدیموكراسی باس لەوە دەكرێ كە سێ دەسەڵات وجودی هەیە لەدەوڵەت (دادوەری ، چاودێری و تەشریعی"پەرلەمان" ، جێ بەجێ كردن

لێرە قسەمان لەسەر بنەماكانی تەنزیم كردنە كە بریتیە لە دەسەڵاتی دادگا (بەرزترین دەزگای دادگا (بریتیە لە دادگای دەستوری

پەرلەمان چاودیری دەسەڵاتی جێ بەجێ كردن دەكا وەدواتریش هەڵدەستی بەدەركردنی یاسا

(یاسا لەپەرلەمان بەسێ مەرحەلەدا دەڕوا (اقتراح ، تصویط ، تصدیق

اقتراح/ لەلایەن پەرلەمان یان دەسەڵاتی جێبەجێ كردن دەكرێ

تصویت/ لەلایەن پەرلەمانەوە دەكرێ

تصدیق/ لەلایەن دەسەڵاتی جێ بەجێ كردن دەكرێ

كەواتە لەدەولەتی سیستەم سەرۆكایەتی ، دەسەلاتی جێ بەجێ كردن (سەرۆک) ، لەسەروی دەسەڵاتی پەرلەمانە ، چونكە توانای (اقتراح)ی هەیە ، وەتوانای ڕەفز كردنەوەی (تصویت)ی هەیە ئەگەر (تصدیق) نەكا

دەسەلاتی دادوەری/ چاودێری دەسەلاتی پەرلەمانی و دەسەڵاتی جێبەجێ كردن دەكا لەئەگەری لادان لەدەستوری وڵات

لە گشت ولاتێک ئەندامانی دەسەلاتی دادوەری لەلایەن دەسەڵات تەعین دەكرێن (واتا بە (هەلبژاردن نیە

چ دەسەلاتێک توانای دامەزراندنی ئەندامانی دادگای هەیە ؟

لەپاڵ ئەم سێ دەسەلاتە دەسەڵاتێکی نادیار هەیە ولات بەڕێوە دەبا لەگشت وڵاتان ، ئەم دەسەلاتە بریتیە لە دەسەڵاتی ئەمنی

دەسەڵاتی ئەمنی ئەو دەسەلاتەیە کە ئەندامانی دەزگاکانی دادوەری دادەمەزرێنێ .

لەگشت وڵاتان دەسەڵاتی دادوەری لەژێر سێبەری دەسەڵاتی (ئەمنی) دایە (دەسەلاتی ئەمنی قودسیەتێکی لەبەرچاوی هاووڵاتیان دروست کردووە بۆ دەسەلاتی دادوەری

ئەگەر دەسەلاتی جێبەجێ کاری هاوڕا بێت لەگەڵ دەسەلاتی (ئەمنی) ئەوا کێشە بۆ دەسەلاتی جێ بەجێکاری دروست ناکرێ ، بەلام ئەگەر دەسەلاتی جێ بەجێکاری بۆچونی جیای هەبوو لەگەڵ دەسەڵاتی ئەمنی ئەوا یەکێک لەم دوو حاڵەتانە ڕوودەدا

یەکەم / کودەتایەکی ڕاستەوخۆ بەسەر دەسەڵاتی جێ بەجێ کاری دەکرێ

دووەم / ئەگەر مەجالی کودەتا نەبوو ئەوا لەڕێگای دەسەڵاتی دادوەری شەڕعیەت لە دەسەلاتی جێ بەجێ کاری دەسێنرێتەوە

کەواتە دیموکراسی تەنها عەمەلیەیەکی ڕوکەشیە بەلام لەناوەڕۆک لەژێر قیادەی دەسەلاتی ئەمنی دایە بەهۆی ئەوەی دەسەلاتی دادوەری لەژێر قیادەی دەسەلاتی ئەمنی دایە و هێز لەژێر دەسەڵاتی ئەمنی دایە

حوکم لە ئیسلام بریتیە لە فەرمانڕەواییەک لەژێر جێ بەجێ کردنی حوکمەکانی قورئان

لەئیسلام دوو دەسەڵات هەیە

یەک / دەسەلاتی مەحکمەی شەڕعی

دوو / دەسەڵاتی جێ بەجێ کاری

دەسەڵاتی (ئەمنی) وجودی نیە

دەسەلاتی تەشریعی وجودی نیە

لەئیسلام دەسەڵاتی جێ بەجێ کاری شەڕعیەتی پەیوەستە بە دەسەڵاتی شەڕعی ،،، چونکە شەڕعیەتی حاکمی وڵات(دەسەڵاتی جێ بەجێ کاری) پەیوەستە بە چەندی پابەند بوونی حاکمی وڵات (بە جێ بەجێ کردنی شەریعە (الاحکام الشرعیە

لەئیسلام دەسەڵاتێکی (مخفي) نیە بۆ بەڕێوە بردنی وڵات وەکو سیستەمی دیموکراسی بەلکو لەئیسلام بەڕوونی دوو دەسەڵات هەیە یەکیان حوکمە کەلە قورئان سەرچاوەی گرتوە ، ئەوەی دیکەیان حاکمی وڵاتە ، حاکمی ولات قابلی گۆڕین نیە مەگەر لەسنوری دەسەلاتی شەڕعی (الاحکام القرءانیة) لابدا

دیموکراسی عەمەلیەیەکی ڕوکەشیە لەناوەڕۆک نەگۆڕە (واتا ئەگەر یەکێک لە بنەماکانی (موخابەڕات لابدا لادەدرێ

بەلام ئیسلام دەسەلاتێکی ڕون و ئاشکرایە لەژێر قیادەی ئەحکامی قورئان وە حاکم تێیدا نەگۆڕە مەگەر لەسنوری شەرع (قورئان) لابدا

لە ئیسلام دەقە ئەحکامیەکانی قورئان سائیدە واتا دەسەڵاتی جێ بەجێکاری ئیطاعە دەکرێ ئەگەر ئەم دەسەڵاتە موطیع بوو بۆ حوکمەکانی قورئان ، لەوکاتە (اسمع واطع وان امر علیکم عبد حبشي ما اقیم فیکم کتاب الله

کەواتە حوکمی ئیسلام ڕێکتر و جوانتر و ڕونترە لە دیموکراسی چونکە دیموکراسی تەنها سێبەرێکە لەژێر حەڕەکەی دەسەلاتی ئەمنی ،،، بەلام حوکمی ئیسلام ڕاستو ڕوون بنەماکانی دەستوری بریتیە لەقورئان

بۆیە ئیشارەم بە بنەماکانی دەستوری کرد لەبەرئەوەی بنەما دەستوریەکانی دەولەتی دیموکراسی دیسانەوە لەژێر ڕیعایەتی دەسەڵاتی ئەمنی دادەڕێژرێ کە بریتیە لەڕەچاوکردنی کۆمەڵێک بەرژەوەندی ، بەلام بنەماکانی دەستوری ئیسلام نەگۆڕە

## وانەی شازدە

واقع لەنێوان سیناریۆ و ستڕاتیج

واقع / ئەو ڕوانگەیە لەسەرنجێکی ژیرانە هەڵدەقوڵێ بۆ ڕووداوەکان

سیناریۆ / وصف لوضع مستەقبلی وسبل ادارتە (دروست کردنی وەزعێکە لەبەر چاوی کۆمەڵگا بۆ مەبەستێکی شاراوە)

سیانریۆ دوو بەشە

یەک / صناعة الأزمة (الإدارة بالأزمة)

دوو / مواجهة الأزمة (الإدارة الأزمة)

یەک / صناعة الأزمة (الإدارة بالأزمة)

ئەم بەشەیان بریتیە لە دروست کردنی کێشەیەک لەسوچێکی دیاری ژیانی کۆمەڵگا تاکو سەرنجی خەڵک لەسەر دەسەڵات نەمینێ بۆ ماوەیەک تا خەڵک سارد دەبێتەوە

دوو / مواجهة الأزمة (الإدارة الأزمة)

ئەم بەشەیان بریتیە لە دروست کردنی کێشەیەک بەرانبەر کێشەیەکی ڕاستەقینە بۆ پەرت کردنی سەرنجی خەڵک بەرانبەر کێشە ڕاستەقینەکە

.

ستڕاتیج / صناعة المستقبل والعمل علی تحقیقە (دروست کردنی داهاتوو وەکارکردن بۆگەیشتن بەو داهاتووە

ستڕاتیج دوو بەشە

یەک / دوور مەودا

دوو / نزیک مەودا

کاتێ باسی ستڕاتیج دەکەین دەبێ باسی تاک تیک بکەین

تاک تیک / بریتیە لەجۆری ئەوکردانەی بۆگەیەشتن بە ستڕاتیج ئەنجام دەدرێ ، واتا تاکتیک بنەمای گەیشتنە بەستڕاتیج

زۆری جار لەلایەن دەسەڵات و زلهێزەکان سینارۆ دەکرێ بۆ ستڕاتیج ، واتا سیناریۆ بەشێکە لە تاکتیک بەلام دەبێ ئەمە بزانین سیناریۆ لەلایەن دەسەلات و زلهێزەکان ) لەسەر مستەوای نێودەوڵەتی و لەسەر مستەوای وڵات کارێکی سنوردارە )، واتا حەجمی سیناریۆ دیاریکراوە ئەگەر لەو حەجمە دیارە دەرچوو ئەوا سیناریۆ نیە بەڵکو واقعە بەلام زۆرجار دەسەڵات واقع بەسیناریۆ دەناسێنی لەبەر چاوی خەلک

بۆ نمونە داعش (هیچ هێزێکی دونیا ناتوانێ سیناریۆیەکی لەو حەجمە دروست بکا ، بەڵام ئاساییە (اختراق) کردن بۆ ئاراستە کردنی هەندێ عەمەلیە وەکو تاکتیک

دەبێ واقع بناسین لەنێوان سیناریۆ و ستڕاتیج ، ئەمە چۆن دەکرێ

بە سەرنج دانە ستڕاتیجی دەسەڵات و ناسینی ستڕاتیجی دەسەڵات بەشێکی زۆر لەسینارۆکانت بۆ ئاشکرا دەکا (لەبابەتی دواتر باسی نەزەڕیەی موئامەڕەم دەکەم) ، ئەگەر شارەزا نەبیت لەنەزەڕیەی موئامەڕە توشی ئەمە دەبیت کە واقع و سیناریۆت لێ تێکەڵ ببێت.کەواتە بە زانیاری دەربارەی ستڕاتیج و زانیاری دەربارەی نەزەڕیەی موئامەڕە بەشێوەیەکی زۆر سیناریۆ و واقعت بۆ لێک جیا دەکرێتەوە.

## یوختەی حەڤدە:

### ڕووداو لەنێوان واقع و نەزەڕیەی موئامەڕە

مەبەستم لەڕووداو حالەتێک کە تەئسیراتی ئابوری یان سیاسی یان ئەمنی لێ بکەوێتەوە

واقع ئەو ڕوانگەیەیە لەسەرنجێکی ژیرانە هەڵدەقولێ بۆ ڕوداوەکان

نەزەڕیەی موئامەڕە /واتا ( عدم قدرة على تحليل الامور وتحدث عن الموضوع في مكان اخر ،،، او ،،، عدم استيعاب الأمور

نەزەڕیەی موئامەڕە دوو بەشە:

بەشێک  لە بێ ئمکانیەتی زانیاری هەڵدەقولێ

بەشێکی دیکەی لە ئیمکانیەتی زانیاری هەڵدەقولێ

ئەو بەشەی  لەبێ ئمکانیەتێ زانیاری هەڵدەقولێ ئەوەیە کە دەسەڵاتی هەر وڵاتێک و وڵاتە زلهێزەکان بەردەوام جەوێک لە زهنی خەڵک دەخولقێنن تاکو تێگەیشتنی خەڵک لەسەر واقعی ڕووداوەکان بخلیسکێ ... واتا سیقەی خەڵک دەڕوخێنن بەرامبەر بەهەر حالەتێکی ڕاستەقینە کە (گوایە ئەمە دەستی لەپشتە یان دروست کراوە

بۆ نمونە ئەمریکا وای نیشانی خەڵکی جیهان داوە کە دەسەلاتی عەسکەری و موخابەڕاتی تائەو ڕاددەیە بەهێزە هەرچی بیهەوێ دەیپێکێ ؟ بەلام ئاوا نیە چونکە

ئەمریکا لە ڤێتنام شکا

ئەمریکا لەکۆریا بەرانبەر شیوعیەکان فەشەلی هێنا

ئەمریکا لەعێڕاق فەشەلی هێنا

ئەمریکا لەئەفغانستان فەشەلی هێنا

ئەمریکا نەیتوانی وەزعی سوریا بۆ قازانجی خۆی یەکلا بکاتەوە

لە جەنگی جیهانی دووەم تاکو ئێستا ئەمریکا دوو سەرکەوتنی بەدەست هێناوە

١ـ بەهۆی بۆمبی ئەتۆمی بەسەر یابان سەرکەوت ئێستا تەنها ئەمریکا خاوەن بۆمبی ئەتۆمی نیە وەکو ئەوکات ، کەواتە بۆمبی ئەتۆمی توانای یەکلا کردنەوەی لەدەست دا بۆ ئەمریکا

٢ـ سەرکەوتن بەسەر جەماعەتە جیهادیەکان ئەم جەماعەتانە خاوەن پێگەیەک و عومقێکی سنوری و عەسکەری و سیاسی ستراتیجی نین بۆیە لێدانایان ئاسانە ، لێرە مەبەستم لە ستراتیج (پیشەسازی عەسکەریە) بۆ نمونە بزوتنەوەی حەماس لەبەرانمبەر ئیسرائیلی خاوەن نەوەوی و پشتیوانی نێو دەولەتی نیە بەلام بەهۆی بونی سنوور و ئەو پیشەسازیە سەرەتاییەی لەدروست کردنی چەک ئیسرائیلی ئیحراج کردووە

کەواتە نەزەریەی موئامەرە دروست کردنی بیروبۆچونێکە بۆ رووداوە هەستیارەکان لەغەیری حەقیقەتی رووداوەکە ( ئەمەیان لەقازانجی دەسەلاتە) چونکە مللەت چەق بەستو دەکا لەئاست گۆرانکاری ، ئەو بەشەی دیکە لە نەزەریەی موئامەرە بۆ خاوەن پێگە سیاسیەکانە ( لەسیاسەتداری متمانەی گشتی نابێ وجودی هەبێ واتا دەبێ بەشی گومانی تێدا بهێلیەوە) بەلام ئەم گومانە دەبێ نسبی بێت نەوەک بگاتە ئەو ئاستەی ترس لەبریاردان دروست بکا.

## **:پوختەی هەژدە**

## ئافرەت لەنیوان سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی

جیاوازی نێوان قائد و سەرۆک

**(نمونە / ئافرەت)**

**(leadership)** قیادة

قیادە زیاتر صیفەتە نەک پۆست واتا قیادە خۆی لەصیفەتي کاریزما دەگرێتەوە **/**

**(headship)** رئاسە

سەرۆک بریتیە لە پۆست ، مەرج نیە ئەوەی ڕەئیس بێت صیفەتی قیادەی هەبێ تێدا **/**

هەریەکێ لەئێمە تەعامولێکی سادە یان چڕی هەبوە لەگەڵ ئافرەت ، لەنەتیجەی ئەم تەعامولە بۆی دەرکەوتووە کە مستەوای مەعریفی و خولقی ئافرەت لەچ ئاستێکە

لەڕووی زانستی ژمارەی هۆرمۆنەکانی لەشی پیاو جیان لەژمارەی هۆرمۆنەکانی لەشی ئافرەت ; کەم و زیادی هۆرمۆنەکان تەئسیر لەسەر میزاج و عاطیفە و ئیحساسی ئینسان دەکەن .. ئەمە جیا لەهەڵکەوتەی لەشی ئافرەت کە ناسکە**.**

ئافرەت پێکهاتەیەکە لە عاطیفە و میزاج و ئیحساس

عاطیەفەی ئافرەت : زوو موتەئەسر دەبێ بەدەور و بەرامبەر

میزاجی ئافرەج : ناتوانێت جێگیر بیت لەسەر ڕوانینێک

ئیحساسی ئافرەت : زوو هەستی لەسەر ئەو شتە لادەکەوێ کە عاطیفەی بۆی چووە

بۆ نمونە شەرع کەمترین ئەرکی لەسەر ئافرەت دانایە:پێغەمبەر دەفەرموێ (إذا صلت المرأة خمسها ، وصامت شهرها ، وحفظت فرجها ، وأطاعت زوجها قيل لها ادخلي الجنة من أي أبواب الجنة شئت)کەواتە عاطیفەو ئیحساس و میزاجی ئافرەت ئاوایە کە ناتوانێ لەگەڵ جددیات تاکۆتایی بڕوا ،

**(**پێغەمبەر لەحەدیسی صەحیح دەفەرموێ (لن يفلح قوم ولو امرهم امرأة

بەڵێ ئافرەت دەبێ مامۆستا بیت ، مامۆستای زانکۆ بێت ، پزیشک بێت ، پەرستار بێت ... ، بەلام نابێت قائد بێت چونکە ئیحساس و عاطیفە و میزاجی رێ نادەن قیادەیەکی حەکیمانە بکا

بۆ نمونە (ئەنجیلا مێرکل) مستەشاری ئەلمانیا سەرۆکایەتی ئەلمانیا دەکا نەوەک قیادە کردن ؟; لە ئەوروپا سوڵطەی کاریزما هەیە نەک قیادەی کاریزما واتا سەرۆک تەنها ئالەیەکە لەدەست سیستەمی ولات ، ئەگەر جەنگێک رووبدا سیستەمی کاریزما پەکی دەکەوێ و نۆرەی قیادەی کاریزما دەگەڕێتەوە ، بۆیە ئەوکاتە ڕاستەوخۆ سیستەمی ئەڵمانیا (مێرکل) لادەدا پیاوێک دادەنێ چونکە جەنگ پێویستی بە قیادە کردنە نەک سەرۆکایەتی کردن

قیادە کردن واتا چی ؟ : واتا هەڵسوڕاندنی ئمورێک لەکاتێکی هەستیار

لەهەردوو جەنگە جیهانیەکە بۆچی ولاتان ژنێکیان نەکردە سەرۆک ،،، هەر ژنێک کە ئێستا سەرۆکە تەنها کاربەڕێکەرە نەک تەدبیرکەر

لەجەنگی دووەمی جیهانی بەریتانیا بانگی (چەرچل)یان کرد وتیان وەرە ببەوە سەرۆک تەدبیری ئموری ئەو مەرحەلەیەمان بۆ بکە ، ئەمریکا هەڵبژاردنی ڕاگرت وتیانە (ڕۆزفیلد) تۆ تەدبیری ئەو مەرحەلەیەمان بۆ بکە ... لەهیچ وڵاتێک سەرۆکێکی ئافرەت نەبوو لەکاتی ئەم جەنگە بەلام بەداخەوە حزبە ئیسلامیەکان لەسیستەمی ناوخۆی حزبەکەیان بۆ ڕازی کردن و سەرنج ڕاکێشانی تەڕەفی عەلمانی لەسەرکردایەتیان ئافرەتیان زیاترە لە حزبە عەلمانیەکان .کاتێ تۆ هاتی سیستەمی دیموکراسیت هێنا لەناوەخۆی حیزبەکەت پەیڕەوت کرد ئەمە واتا ئیمان بون بەدیموکراسی ((کەواتە(( لیس الذکر کالأنثی

کاتێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ (النساء ناقصات العقل والدین) مەبەست لە دین ئەوەیە کە ئافرەت سوڕی مانگانەی هەیە ، مەبەست لەعەقڵ ئەوەیە کە عەقڵی ئافرەت دەرکی قیادە کردن ناکا

بەڵام ئافرەت لەمەجالی زانست دەکرێ پێش پیاو بکەوێ یاخود شان لەشانی پیاو بدا نمونەی ئەو جۆرە ئافرەتانە لەمێژوی ئیسلام زۆرن

بۆ نمونە :

فاطمەی کچی قیس

تاکە کەسە لە ئافرەت و پیاو حەدیسی دەججالی ڕیوایەت کردیە دوای وەفاتی ئیمام عمر ، وەکو ڕێز بۆ ئەو ئافرەتە مەجلیسی شورا لەماڵی ئەو ئافرەتە کۆبونەوە (عثمان)یان دیاری کرد بۆ خەلیفە ، عائیشە ڕەزای خودای لێبێ دەفەرمووێ ڕەحمەتی خودا لە ژنانی ئەنصار شەرم وای لێنەکردن واز لەزانستی شەرعی بێنن.

## وانەی نۆزدە:

(جیاوازی نیوان ململانێ و جەنگ (الصراع والحرب

ململانێ (الصراع) بریتیە لەپرۆسەیەکی سیباق لە چوارچێوەی سنور و یاسایەک (نمونە دیموکراسی ، واتا صیراعی نێوان حزبەکان

جەنگ (الحرب) بریتیە لە هەر هەنگاوێک لەدەرەوەی سنور و یاسا (ئەم هەنگاوە "لەچاو لەناو چاوێکەوە" دەست پێ دەکا تاکو شەرە بۆمب

سنور بریتیە لە سنوری خاک و سنوری دین

تلک حدود الله فلا تقربوە)

یاسا بریتیە لەو دەقە نێودەوڵەتیەی باس لە (عدوان) دەکا (مەبەست یاسای جەنگە

لەپرۆگرامی نێودەوڵەتی سنور بریتیە لەتەنها خاک بەلام لەواقع سنور بریتیە لەهێلی نێوان دینەکان ، ئەم هێلە هەستیارترین هێلە ، هیچ ئینسانێ بەدەر نیە لەهەڵگری دینێک تەنانەت ئەوەی بەخۆی دەلێ باوەرِم بەهیچ دینێک نیە "ئەم باوەرِ نەبونە خۆی دینە" ، دژایەتی هەر دینێک دینە ، خۆشەویستی هەر دینێک دینە

دین واتا پرۆگرام ، دیموکراسی دینە باوەرِ بوون بەدیموکراسی دینداریە بەلام کارکردن لەناوی لەناچاری عوزرە.

تەنها دوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی جەنگی دینی نەبوون  بەڵکو جەنگێکی کیشوەری نێوان نەتەوەگەلێکی مەسیحی بوو بۆ فراوان کردنی سنور و تەماحکاری بۆیە بەرهەمی نەبوو سنوری وڵاتەکان وەک ۆی مایەوە وەکاتەکەشی کورت بوو تەنها خەڵکێکی زۆری تێدا کوژرا ، بەلام ئەگەر بگەرێینەوە دواوە بۆ مێژوو شەرێ نێوان فارسەکان و رۆمەکان کە دوو نەتەوەی خاوەن حەزارەتی جیا بوون چەندین ساڵ شەر و کوشتار لەنێوانیان هەبوو.

حەزارەت بریتیە لەدین چونکە کۆمەڵێک پابەندیە کە پابەند بووەکان بەشکۆی دەزانن (((ذلك ومن یعظم شعائر الله فانها من تقوی القلوب))) هەر بەرز راگتنێک لەسەر مستەوای نەتەوە یان کۆمەلگا دەبیتە دین

ئەوەی دەبێ بیزانین جیهان ئێستا لە جەنگێکی دینی دایە  (رۆژائاوا و گشت دینەکان  هاوپەیمانن بەرانبەر دینی ئیسلام))

## :پوختەی بیست

وەسەطیە

میانڕەوی و تونڕەوی دوو بیدعەی مێژویین کە لەتاریخی ئیسلام سەریان هەڵدا

مورجیئە واتا ڕەجا ، فیرقەی مورجیئە تەنها ڕەجایان هەبوو باوەڕیان بە خەوف نەبوو

خەوارج خەوفیان هەبوو ڕەجایان نەبو

ئەم دوو فیرقەیە سەرچاوەر دروست بونی ئەم دوو بیدعەیەن

خودای گەورە دەفەرموێ (أولئك الذين يدعون يبتغون إلى ربهم الوسيلة أيهم أقرب *ويرجون رحمته ويخافون عذابه*)

وەسەطیەت بریتی نیە لە چەق بەستوویی لەنێوان توندرەوی و میانڕەوی ... بەڵکو بریتیە لە (لكل مقام مقال) (فاعط كل ذي حق حقه) واتا شوێنێک توندی بوێت توندی بەکار دێت وە شوێنێک نەرمی بوێت نەرمی بەکار دێت .

کاتێ وەسەطیەت مەوجود بوو ئنجا دەعوە حەقی دەدرێ ، خودای گەورە دەفەرموێ

(*وكذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا *شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا

**شهداء* على الناس ويكون الرسول عليكم *شهيدا

شهداء : جەمعی شەهیدە ، شەهید واتا شاهید ، شاهید واتا شایەدی دان لەسەر حەقانیەتی خودا ، حەقانیەتی خودا بریتیە لە دان نان بەفەرمانڕەوایی و یەکتاپەرستی خودا

کەواتە شەهید واتا داعی

خودا گەورە دەفەرمووێ کاتێ دەتوانن شایەدی بدەن لەسەر حەقانیەتی خودا ئەوکاتەی وەسەطیەتان تێدا بێت.

پوختەی بیستویەک

## نیشتمان

نیشتمان لەئیسلام/ پێغەمبەری خودا کاتێ کۆچی کرد ؟ لەڕێگادا وتی ئەی مەککە بەڕێزترین خاکی خودای بۆیە لەدڵی من خۆشەویسترینی ... واتا خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ مەککە لەسەر ئەساسی (بیت الله) بووە نەک نیشتمان ... ، کاتێ چوە مەدینە لەوێ ئەنصار خەڵکانێکی زۆر بەڕێز و بەهەڵویست و مسوڵمان بوون ... لەکاتی فەتحی مەککە جەماعەتی ئەنصار دڵیان توند بوو وتیان پێغەمبەر ناگەڕێتەوە مەدینە بەڵام پێغەمبەر پێیانی فەرموو ژیان ئەو ژیانەیە لەگەڵ ئێوە بێت مردنیش ئەو مردنەیە لەگەڵ ئێوە بێت ... پاشان پێغەمبەر گەڕاوە مەدینە لەوێ قیادەی دەوڵەتی کرد ... کەواتە لەئیسلام ئەصڵ خەڵکە نەک خاک بۆ سیاسەت ، بۆ عیبادەت مەککە پیرۆزترین خاکەو قیبلەی مسوڵمانانە**...**

## پوختەی بیستودوو:

# (((کیان)))

## کیان بریتیە لەو سنورە جوگرافیەی لەژێر فەرمانڕەوایی مەنهەجێک دایە

بنەماکانی دروستبون و بەهێزبوونی کیان

(بانگەواز (الدعوة

(کۆچ (الهجرة

(گوێڕایەلی (الاطاعة

(لەخۆبوردەیی (التضحیة

(ئارام گرتن (الصبر

:ئەم پێنج بنەمایە خاڵی سەرەکی دروست کردنی کیانن

(کیان مەبەست لێی ناوەندی بڕیارە لەسنورێکی دیاریکراو (المرکز القرار

(کیان پێویستی بە فکرەیەکە کە بکرێتە بنەمای کار (الدعوة -1

(کیان پێویستی بە ناوچەیەکی سنور دیاریکراو هەیە (الهجرة-2

(کیان پێویستی بە گوێڕایەلی تاک هەیە تاکو پێگەی بەهێز بێت (الاطاعة -3

-4 (کیان پێویستی بە لەخۆبوردەیی تاک هەیە (التضحیة

-5 (کیان پێویستی بەبەردەوام بونی تاک هەیە (الصبر

.

## : پوختەی بیستوسێ

# بنەماکانی دروست بونی کیان

بنەمای یەکەم/

مەنهەج / بریتیە لە کۆی ئەو خاڵ و بەندانەی کەلەلایەن خەڵکانێک پەیرەوی لێ دەکرێ (نەتەوە ، کۆمۆنیست ، سۆشیالیست ، لیبرالیست ، دیموکراسی ، دیکتاتۆری ، مەسیحی ، یەهودی ، بودایی ، ئیسلام ...) هەر یەک لەمانە مەنهەجە

بنەماکانی دروست بونی کیان

یەکەم / بانگەواز (دەعوە) لەسەرەتا دەبێ جیاوزی نێوان جیاوازی نیوان دەعوە(داعي) و موعظە(واعظ) بزانین *باسیم کردیە* ، چونکە لەنێو مسوڵمانان تێکەڵ بونێک ڕوویدایە لەم دوو مانایە ، بۆیە هەر چەمکێک بتهەوێ کاری لەسەر بکەی دەبێ لەسەرەتا پێناسەکەی بزانیت ئەگینا گشت هەنگاوەکانی دواتر بەهەلە دەڕوا ...

دەعوە / بریتیە لە (يا قوم اعبد الله مالكم من اله غيره) ... واتا بانگەواز بۆ ناساندنی (ألوهية)ی خودایە

، اله / دوو مانای هەیە :

یەکەم / فەرمانڕەوا

دووەم / فەریادڕەس

کەواتە دەعوە بریتیە لە تێگەیاندنی بەرانمبەر لەوەی کە خودا قەبوڵ بکا وەکو فەرمانڕەوا وە وەکو فەریادڕەس

فەرمانڕەوا / واتا (ان احكم بينهم بما انزل الله ) فەرمانڕەوایی خودا بریتیە لە ڕازیبوونی بەندە بە حوکمەکانی قورئان

فەریادڕەس / واتا (ويدعون ربهم خوفا وطمعا ) فەریادڕەس بریتیە لە ڕازیبونی بەندە بە ترس و ئومید لەخودا ، کاتێ باسی ترس و ئومید دەکەین مەبەست لە (توكل)ە ئەگینا هەندێ ترس و

ئومێد هەیە لەدونیا واردە ، بۆ نمونە موسا دەفەرموی (ولهم علي ذنب فأخاف يقتلون) ...
(فأصبح في المدينة خائفا يترقب )

موعظة/ بریتیە لە (فذكر فإن الذكرى تنفع المؤمنين) واتا دوای ئەوەی تاک بینا کرا لەسەر نەتیجەی دەعوە ، دوای ئەوە دەبێتە ئیماندار (باسی ئیمانم کردیە لەبابەتی پێشوو) ئیتر ئەم تاکە پێویستی بە ئاگادار کردنەوە هەیە بە ترس و ڕەجای خودا چونکە ئیمان کەمی و زیادەی تیدا دەکەوێ (الإيمان يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية )

کەواتە تاک پەروەردە دەکرێ و پێدەگەیەنرێ لەسەر ڕازیبوون بە (الوهية)ی خودا ، وتمان کیان ئەو سنورە جوگرافیایەیە لەژێر فەرمانڕەوایی مەنهەجێک ...  تاکی پێگەیشتوو بە بەرهەمی دەعوە (پەروەردەی دەستی داعی) ڕازیە و بەئاواتەوەیە بۆ ئەو کیانە

تێبینی / مەرج نیە حاکم بتوانێ لەیەک زرۆفدا گشت حوکمەکانی قورئان جێ بەجێ بکا ، هەروەکو ئیمام علي نەیتوانی قصاص جێ بەجێ بکا بەسەر بکوژانی ئیمام عوسمان

## بیستوچار یوختەی:

# بنەماکانی دروست بوونی کیان

بنەمای دووەم /

کۆچ (الهجرة) کۆچ لە مصطلحي ئیسلامی / بریتیە لە رۆیشتن لەسنوری فەرمانڕەواییەک بۆ سنوری فەرمانڕەواییەکی دیکە (واتا جێهێشتنی زەلیلی ... بۆ بونیادنانی عەزیزی ، پێغەمبەر دەفەرموێ (لاهجرة بعد الفتح الا جهاد ونية)

(ئەوانەی دەڵێن کۆچ واتا لەگوناح بەرەو چاکە) ... (ئەمە تەنها قسەیەکی بێ ئەرزشە) ، دوو جۆر کۆچ هەیە : پێغەمبەر دەفەرمووێ ( فمن كانت هجرته إلى الله ورسوله فهجرته إلى الله ورسوله ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها أو امرأة ينكحها فهجرته إلى ما هاجر إليه) - هجرەت بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی (ئەمە مەئجورە) - هیجرەت بۆ دونیا (ئەمەیان مەرج نیە تاوان بێت ، هەموو کەسێ حەقی ئەوەی هەیە بەدوای ژیانێکی شایستە بگەڕێ ،،، بەڵام مەئجور نیە) خودای گەورە دەفەرموێ (والذين آمنو وهاجروا وجاهدوا في سبيل الله والذين آوو ونصرو أولئك هم المؤمنون حقا ) ، (إن الذين آمنوا وهاجروا وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبيل الله والذين آووا ونصروا أولئك بعضهم أولياء بعض والذين آمنوا ولم يهاجروا ما لكم من ولايتهم من شئ حتى يهاجروا وإن استنصروكم في الدين فعليكم النصر إلا على قوم بينكم وبينهم ميثاق والله بما تعملون بصير ) پێغەمبەر دەفەرموێ (الايمان بضع وسبعون شعبة اعلاها لاإله الا الله) لەدوای ئثباتی (ألوهية)ی خودا کە لەبابەتی پێشو باسیم کردیە ... ، ئەم جارە چەند ژوورێکی دیکەی ئیمان هەن : لەبابەتی پێشو باسی ڕوکنەکانی ئیمانم کرد وە باسی (ولاء وبراء)م کرد کە یەکێ لە ژورەکانی ئیمانە ، هیجرەت ژورێکی دیکەی ئیمانە ... هیجرەت بابەتێکی حەرەکیە لەواقع ڕەنگدانەوەی هەیە پێغەمبەر دەفەرموێ (لاهجرة بعد الفتح الا جهاد ونية ) ئایا ئەم حەدیسە مەبەستی فەتحی (مەککەیە) ؟ ئەم حەدیسە مەبەستی تەنزیم کردنی هیجرەتە ، چونکە هەر زەمەنێک جۆرێ تەعاملی لەگەڵ دەوێ ... بۆ نمونە لەزەمەنی ئێستا هیجرەت واجب نیە چونکە ئەوکات لەلای قورەیش ئیسلام مەمنوع بوو بەهەموو شێوەیەک ، بەڵام ئێستا دەعوەی ئیسلام لەسەرتاپای دونیا هەیە مەگەر چەند دەوڵەتێکی لێ دەربچی (نمونە بۆرما) کەواتە ئەگەر دەعوە مەوجود بوو لەو خاکەی تۆی تێدا بوو ئەوا هیجرەت واجب نابێ چونکە جێهێشتنی ئەو خاکە واتە مەعتەل کردنی دەعوە (واتا هیجرەت لەحالەتێک واجبە کە ئیسلام مەمنوع بوو لەو خاکە) ...

بەشێوەیەکی گشتی هیجرەت دەبێتە دوو بەش/

بەشی یەکەم : هیجرەتی حەبەشە کەبۆ پاراستنی ئەمنیەت بوو ..

بەشی دووەم : هیجرەتی مەدینە کەبۆ بانگەوز و کیان بوو

ئێمە قسەمان لەسەر (کیان)ە ، کیان پێویستی بە دەستەجەمعیەکی هاوبیران هەیە تاکو بکەوێتە سەر پێ و خۆڕاگر بێت بۆ نمونە لەڕووی ئابوری ، ئەو وڵاتانەی ئابوریەکی بەهێزیان دروست کردیە ، یەکێک لەهۆکارەکانی دروست بوونی ئەم ئابوریە بریتیە لە چوونی چەند ملیاردێرێک بۆ ئەم وڵاتە ... کەواتە کیان لەو زەمەنەی ئێستا پێویستی بەوە هەیە چەند بیرمەندێکی مسوڵمان و چەند دەوڵەمەندێکی مسوڵمان و چەند ڕاگەیاندن کارێکی مسوڵمان چەند صنعاتکارێکی مسوڵمان لەسەرتاپای دونیا بچنە پاڵ ئەو کیانە بۆ بەهێزبوونی و خۆڕاگری چونکە مقەوماتی کیان بریتیە لە (ئابوری ، تەکنەلۆجیا و پیشەسازی هێزی

تێبینی / دەکرێ کیان لەو زەمەنە دەوڵەتێک بێت لەناو ئەو سیستەمە دەولیەی ئێستایە

## پوختەی بیستوپێنج:

# بنەماکانی بەهێز بوون و مانەوەی کیان

بنەماس سێیەم/

یەکەم (محبة) خۆشەویستی

دووەم (طاعة) گوێرایەلی

سێیەم (صبر) ئارام گرتن

چوارەم (تضحیة) لەخۆبوردەیی

خۆشەویستی / ئەو هەستەیە ڕەزامەندیەکی گشتی بۆ خۆشەویستەکە دروست دەکا

گوێرایەڵی / ئەو هەستەیە لەخۆشەویستی یان ترس هەڵدەقوڵێ

ئارام گرتن / ئەو لەخۆبوردنەیە کە لەخۆشەویستی هەڵدەقوڵێ

واتا ئارام گرتن و لەخۆبوردن لەکاردا یەک مانا دەبەخشن وە گوێڕایەڵی و ئارام گرتن و لەخۆبوردن ; هەرسێکیان لە خۆشەویستی دروست دەبن بەلام ئەگەر لەجێی خۆشەویستی ترس هەبوو ئەوا تەنها گوێڕایەڵی دروست دەبێ ئەگەر ترسەکە نەما گوێڕایەڵیەکەش نامینێ.

تەمەنی دەسەڵات (کیان) پەیوەستە بەچەندی خۆشویستنی لەلایەن گەلەکەی ، بۆ نمونە(صدام حسین نەیتوانی بۆ یەک ڕۆژ بەرگری لەپایتەخت بکا لەبەر ئەوەی گوێڕایەڵیەکەی هەڵقولاوی ترس بوو ،،، بەڵام لەکاتی هەوڵی کودەتای تورکیا خەڵکی بەهۆی خۆشەویستیان بۆ دەسەڵات ڕژانە سەر جادە کودەتایان فەشەل پێ هێنا ، ئەم ڕژانە سەر جادەیە بریتیە لە لەخۆبوردەیی )

گوێڕایەڵی سێ بەشە ; - بەهۆی ترس (دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکان نمونە کۆریای باکور) -بەهۆی بەرژەوەندی (نمونە ئیمارات) - بەهۆی خۆشەویستی (دەوڵەتی دەستوور مەبدئی) بۆ نمونە ئیمپراتۆریەتی یابان کە گەلەکەی ئامادە نەبون تەسلیمی ئەمریکا بن تاکو وەشاندنی بۆمبی ئەتۆمی

دابین کردنی خۆش گوزەرانی بۆ خەلک ڕازی بوون دروست دەکا بۆ دەسەڵات نەک خۆشەویستی وە نسبەتێکیش لەگوێڕایەڵی دروست دەکا بەڵام (((صەبر و تەزحیە))) دروست ناکا ... بۆ نمونە وڵاتی ئیماڕات لەسەر ئەساسی دابینکردنی خۆشگوزەرانی گوێڕایەڵی لای گەلی ئیامارات دروست کردووە بەلام ئەگەر ئیمارات بکەوێتە حالەتێکی تەنگەتاو ئەم گەلە ئامادە نیە تێ بکۆشێ چونکە تێکۆشان لەمەبدەء هەلدەقوڵێ کەواتە دەسەڵاتێک ئەگەر تەنها (مصلح) بێت تاکە قازانجێکی ئەوەیە کە خەڵک لێی ڕازی دەبێ ئەمەش تەنها لە ((( گوێڕایەڵی))) خۆی دەگرێتەوە بەڵام ناپەڕێتەوە بەشی ( صەبر و تەزحیە) چونکە (صبر و تضحیة) لەمەبدەء دروست دەبێ وە مەبدەئیش خۆشەویستی دروست دەکا .

دەسەڵات بۆ مانەوە و بەهێز بوونی پێویستی بە (مبدء)ە ، مەبدەئی کیان ئەم چوار حالەتە لەدڵی گەل دروست دەکا (اطاعة ، محبة ، صبر ، تضحیة) بۆ نمونە (دەولەتی عەباسی و عوسمانی کاتێ ڕوخان کە مەبدەء لەدەسەڵات لەوپەڕی کاڵ بونەوەدا بوو ... دەبێ بزانین مەبدەء چیە ؟ مەبدەء بریتیە لەکۆمەڵە بنەمایەکی دینی و عورفی . ئەم کۆمەڵە بنەما دینی و عورفیە پێویستی بە بانگەواز (دعوە) بۆ کردنە (((لەبابەتی پێشو باسی بانگەوازم کردیە))) نمونە / سعودیای مەلەکی (سەلەفی) لەسەرەتای دروست بوونی تاکو سەردەمی مەلیک عبداللە لەسەر بنەمای مەبدەء ئیشی دەکرد چونکە نوخبەیەک لەزانای (سەلەفی) دروست کردبوو کە (سمع و طاعە)یان لەگوێی خەڵکی چەقاندبوو بەڵام سعودیای ئێستا مەبدەئی وەلانا کردیە قاعیدەی ترس.

## پوختەی بیستوشەش :

### بنەمای گەشەکردنی کیان

عەولەمە/ واتا (جعل الشئ عالميا) بەجیهانی کردنی شتێک

کاتێ قسە لەسەر عەولەمە دەکەین دەبێ قسە لەسەر ئەمریکا بکەین بۆ نمونە بەجیهانی کردنی دۆلار.
جۆرج بۆشی باوک بۆ یەکەم جار ئەم چەمکەی بەکارهێنا دوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت ، دوای
ئەمە ئەمریکا کۆنترۆڵی جیهانی کرد لەڕوی ئابوری و عەسکەری ئەمەش بەهۆی کۆنترۆل کردنی
بڕیارەکانی مەجلیسی ئەمن و مت بوونی ڕوسیا ، ئەم حالەتە بەردەوام بوو تاکو شۆڕشەکانی بەهاری
عەرەبی دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی سوری ، ڕوسیا دابەزیەوە ساحەی جیهانی پەکی زۆرێک لە بڕیار و
حەزەکانی ئەمریکای خست ... بەڵام ئێستاش ئەمریکا لەمەرحەلەی کۆنترۆڵ کردنی جیهان نەکەتیە
ئەمەش بەهۆی ئەوەیە کە دۆلار بەجیهانی کرایە

هۆکاری سەرەکی عەولەمەی ئەمرسکا دوو جەنگە جیهانیەکە بوو لەپاڵ وردە هۆکاری رووکەش
بریتی بوو لە ڕوخانی ئابوری چەند وڵاتێکی گەورە وەکو ڕوسیا

ئەمریکا لەڕوی هەڵکەوتەی ناوچەیی لەوپەڕی دونیایە لەبەرامبەر کیشوەری ئەوروپا و ئاسیا ، کە ئەم
دوو کیشوەرە جیرانن وە قەرباڵغترینن لەدانیشتوان وە پڕ ترینن لە ماددەی کانزایی وە ستراجیترینن
چونکە دڵی دونیان ، بەڵام ئەمریکا کۆنترۆڵی ئابوری ئەم دوو کیشوەرەی کردووە لەکاتێ ئەم دوو
کیشورە دەتوانن بەبێ بوونی کیشوەری ئەمریکا ئاسایی بژین بەڵام ئەمریکا بەبێ بوونی ئەم دوو
کیشوەرە لەزاڵ بوون دەکەوێت چونکە وڵاتانی کیشوەری ئەمریکا وڵاتی هەژارن تواناى ئاڵوگۆڕی
ئابوری بەهێزیان نیە لەگەڵ ئەمریکا . ئەم بەرزبوونەوەی ئەمریکا لەڕوی ئابوری بەهۆی ئەمە بوو کە
کیشوەری ئەوروپا و ئاسیا دوو جەنگی سەرتاسەری گەورەی لێ هەڵگیرسا کە لەڕووی ئابوری و
سەربازی کەوتنە ئاستی صفر ، لەم دوو ڕوداوە حالەتێک دروست بوو کە بریتی بوو لە دابەش بوونی
دونیا بۆسەر دوو جەمسەر (ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت) ، دوای ترازانی یەکێتی سۆڤیەت ئەمریکا
چووە لوتکەی دونیا ، دوای هەڵگیرسانی شۆڕشەکانی عەرەبی ڕوسیا هاتەوە نێو ململانێی جیهانی
لەبەرانبەر ئەمریکا ، دواتر وڵاتێکی دیکە سەری دەرکرد بووە هێزێکی ئیقلمی کە پەکی زۆرێک
لەحەزەکانی ئەمریکا خست لەم ناوچەیە ئەمیش تورکیایە وە تاڕادەیەکیش ئێران ، ئەم حالەتەی ئێستا
پەیدا بووە لەپاڵ جەمسەرگیری دونیا بریتیە لە زاڵ بوونی هەرێمی (المهيمن الاقليمي )

المهين الاقليمي / واتا له کێشوەرێک لەنێوان چەند وڵاتێکی ئەم کیشوەرە وڵاتێک بەهێزەوە سەر ، دەردەکا دەبێتە خاوەن بڕیار و زاڵ بەسەر وڵاتانی دەوروبەری

پوختەی بیستوحەفت

بنەماکانی گەشەکرڕنی کیان

پساندنی عەولەمە

سەرەکیترین هۆکار ئەمەیە کە مامەڵە کردنی تیجارەتی جیهانی بریتیە لە دۆلار هەروەها لەڕوی سەربازی ئەمریکا کۆنترۆڵی دونیای کردووە لەدووری هەزاران کیلۆمەتر ئەمەش بە ناردنی باخیرەی جەنگی لەمسەر بۆ ئەوسەری دونیا بەپاڵپشتی ئابوریە زەبەلاحەکەی کەواتە تاکە کارێکی سیاسی گرنگ و ستراتیجی بریتیە لە پساندنی تۆڕی جیهانی دۆلار ، کاتێ ئەم تۆڕە پسا کەوتنێکی ئابوری ئەمریکی ڕوودەدا چونکە ئەمریکا لەوجودی ئەم حالەی ئێستای هەرگیز حالەتێک دروست ناکا بۆ ڕوودانی جەنگی ئەتۆمی چونکە لەهیچی کەم نیە

بۆیە کەوتنی ئەمریکا لە بەجیهانی بوون لەدوو حالەتەوەیە /

یەکەم ئەگەر جەنگێکی ئەتۆمی هەڵگیرسێ "چونکە ئەم جەنگە بریتیە لەلێدانی شارە ستراتیجیەکان لەنێوان ئەمریکا و ڕوسیا و صین و فەڕەنسا و بەریتانیا")

دووەم ئەگەر دراوی دۆلار لەجیهانی بوون بکەوێ

کەواتە کارکردن لەبەرانبەر ئەمریکا دەبێ بەشێوەیەکی مەرکەزی و دەولەتداری بێت نەک بەشێوەی جەماعات لێرە و لەوێ (بەحیساب لە قازانجی ئەمریکا دەدەن) ... ئەم حالەتە وەکو ختوکەیەکە بۆ ئەمریکا . دەوڵەت بریتی نیە لەدەست بەسەرداگرتنی سنورێک و ڕاگەیاندنی دەسەلات ، بەڵکو دەولەت بریتیە لە عومقێکی مێژوویی و عەسکەری و ئابوری و دبلۆماسی.

:پوختەی بیستو هەشت

## ؟شەڕی دینەکان چیە

لەسەرەتای خەلقی ئادەمەوە تاکو هاتنی محمد صلی الله علیە وسلم دوو جۆر شەڕ هەبوو (کوفر و ئیمان) یاخود شەڕی مەصلەحەت ، لەگەڵ هاتنی محمد صلی الله علیە وسلم شەڕەکە بووە جەمع (دینەکان بەرانبەر دینی ئیسلام) ، ئەم شەڕە لە غەزوەی خەندەق (الاحزاب) دەستی پێ کرد .

شەڕی ئەحزاب

حزب لە قورئان واتا کۆمەڵێک خەڵک لەسەر یەک بیروبۆچونی دینی .

حزب لەزمانی سەردەم واتا کۆبونەوەی خەڵکانێک لەتەنزیمێک لەسەر بنەمای پەیڕەو و پرۆگرامێک .

لەشەڕی ئەحزاب هۆزەکانی عەرەب بەجیاوازی دین (بت پەرست لەگەڵ جولەکەکان یەکیان گرت و چوونە هاوپەیمانەتیەکەوە دژی دینی ئیسلام

بۆچی دینەکان لەوکاتەوە بەرانمبەر دینی ئیسلام دەچنە هاوپەیمانێتی ؟

چونکە دینی ئیسلام پرۆگرامێکی کاملە لە دەوڵەتداری و عیبادەت ، وە دینێکی دەعەویە هەردەم لە بڵاوبونەوە دایە وە تاکە دینە لەسەر ئەصڵی خۆی ماوەتەوە و ناگۆڕێ ،،، لەبەرانمبەردا دینەکانی دیکە زیاتر شێوەیەکی نەتەوەیی و قەبیلەییان وەرگرتیە کە توانای بڵاوبونەوەیان نیە بەڵکو هەردەم لە کورتی دەدەن ... کەواتە ئەو دینانە ترسیان لەهەیمەنەی دینی ئیسلامە بەسەریان

شەڕی مەصلەحەت / ئەو شەڕەیە بۆ داگیرکردنی خاک یا سنورێکی ئاوی یا سامانێکی سروشتی دروست دەبێ ، بەشێوەیەکی گشتی ئەم جۆرە شەڕانە کورت مەودان پاش ماوەیەک هەردوو لایەن دەگەڕێنەوە سەر دەقی خۆی ، بۆ نمونە شەڕی ڕۆم و فارسەکان بەدرێژایی چەندین ساڵ هیچ لایەنێک نەیتوانی ئەوەی دیکەیان شکست پێ بهێنێ بەڵکو ڕۆژێک بۆ ئەمیان بوو ڕۆژێکی دیکەش بۆ ئەویان (بۆیە سەرەتا قورەیش وایاندەزانی شەڕی ئەمانیش لەگەڵ پێغەمبەر یەک بەیەکە ، دیانوت *یوم لنا ویوم علینا*) بەڵام ئیسلام ئیختڕاق دەکاتە ناو کۆمەڵگای بەرانمبەر و بڵاو دەبێتەوە هەروەک نەجاشی لەحەبەشە بووە مسوڵمان ، دواتر سەرانی قورەیش ابو سوفیان ...

لەئێستادا تاکە دینێک وەحدانیەتی تێدا بێت دینی ئیسلامە ،گشت دینەکانی دیکە بونەتە مەعبەدی شیرک ، کاتێ باسی وەحدانیەت دەکرێ واتا (خالق ، زات ، مەعبود) تەنها لەیەک خودا کۆبۆتەوە .. رۆژئاوا وەکو دینی مەسیحی و یەهودی ، وە ئەو وردە دینانەی دیکەش کە لە رۆژ ئاواو و رۆژ هەڵات هەن گشتیان هاوڕان لەگەڵ یەکتر لەبەرانبەر دینی ئیسلام ...

دوو جۆر شەڕ هەیە ، شەڕی بانگەشەی ئیعلامی ، وە شەڕی کوشتار ، دونیا ئێستا لەنێو شەڕێکی ئیعلامی دایە ( شەڕی بانگەشە بریتیە لە لێدان لە بنەماکانی عورفی و بنەماکانی دین) ... کەواتە تەنها دینی ئیسلام دینێکی دەعەویە ، بەردەوام لەدرێژبونەوە دایە لە پابەندبووان لەسەر ئاستی جیهان و ئاستی هەموو دینەکان بۆیە دینەکان کەوتونەتە هاوپیمانی بەرانمبەر مەددی دینی ئیسلام.

## پوختەی بیستونۆ:

## شەڕی دینەکان لەغیابی کیان

ئەگەر کیان مەوجود نەبوو مسوڵمانان چۆن بەرەنگاری ئەم دەستەجەمعیەی دینەکان دەبنەوە لەبەرانبەر دینی ئیسلام ؟

ئیش کردن بۆ ئیسلام لەغیابی کیان بریتیە لە دەعوە

مقەوماتی دەعوە چەند بەشێکە/

١-پارە (بۆیە دەڵێم پارە چونکە لەو مەرحەلەیە ئابوری لەدەست تاک دایە)

٢-رۆشنبیری

٣-زاستی شەرعی

لەو مەرحەلەیە پارەی زەکات و صەدەقەی دەوڵەمەندانی مسوڵمانان تەنها بۆ دوو بەش تەرخان دەکرێ (یەک / هەژاری مسوڵمانان ، دوو/ پرۆژەی دەعوە) واتا لەو مەرحەلەیە مسوڵمانان

موکەلەف نین بە پڕۆژەی خێری گشتی چونکە ئەمەیان ئیشی ئەوکاتەیە کە کیان دروست بوو... لەو مەرحەلەیە دەعوە دەگەیەنرێ لەپاڵ بەڕۆشنبیر کردنی تاکی مسوڵمان بۆ چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ واقع ، چونکە لەوکاتە واقع بەسیناریۆ دەکرێ لەلایەن دینەکان بۆ پوکانەوەو بەلاڕێدا بردنی ئاراستەی دەعوە ...(لەبەشەکانی پێشو ئەو بابەتانەم باس کردیە کە پەیوەندی بەڕۆشنبیری کردنی تاک هەیە) دەعوە بریتیە لە تێگەیاندنی تاک لە فەرمانڕەوایی خودا و یەک خودا پەرستی لەپاڵ مەجموعەیەک زەوابط و ئەخلاقیاتی ئیسلامی بۆ نمونە چاکە کردن لەگەڵ داک و باوک ، ڕێزگرتنی جیران ، سەردانی خزمان ، یارمەتیدانی یەتیم ... (لەبەشەکانی پێشو باسی چۆنیەتی دەعوەم کردیە) لەو مەرحەلە کەسانی داعی دەعوە دەگەیەنن بۆ سەرکەوتنی دینی ئیسلام لە قالبی ستراتیجێک بەڵام بیر لەکاتی سەرکەوتن ناکرێتەوە چونکە زۆرێک لەپێغەمبەران سەرکەوتنیان نەدیت ، سەرکەوتن غەیبە کاتەکەی نادیارە ... ئەگەر بیر لەکاتی سەرکەوتن بکرێتەوە ئەوا یەئس باڵ دەکێشێ بەسەر هێزی دەعوە و لاوازی دەکا ... لەو مەرحەلەیە دەعوە دەبێ لەسەر مستەوای جەماعەتێکی دەعەوی شێوە حزبی (تەنزیمی) بێت چونکە دەعوەی متەفەڕیقە ستراتیجی تێدا نیە . ..صەبر و تەعاون دوو سەرەکیترین چەکی ئەو مەرحەلەیەن

## پوختەی سی:

# شەڕی دینەکان لەوجودی کیان

ئەم مەرەحەلەیە پێویستی بەدوو سیفەتی سەرەکی هەیە

یەک / صبر (اسمع واطع وان امر عليكم عبد حبشي ما اقيم فيكم كتاب الله) واتا پاراستنی کیان ئەولاترە لەهەر حوججەیەک بۆ تێکدانی (بۆ نمونە ئیمام ئەحمەد لەکاتی گرتن و لێدانی بەناحەق بەڵام هیچ کات فەتوای نەدا لەدژی دەوڵەت)

دوو / بيعة (من مات وليس على عنقه بيعة مات ميتة جاهلية) بەیعە بریتیە لەڕازی بوون بە دەسەڵات و بڕیارەکانی دەوڵەت ئەگەر لەدژی خۆشت بێت (بۆ نمونە خالیدی کوڕی وەلید کاتێ لەقیادەی جەیش لادەبردرێ بە ئەمری ئیمام عمر ، خالید ڕاستەوخۆ تەسلیم بەو بڕیارە دەبێ ئەگەرچی لەدڵیشی گرانە)

لەو مەرحەلەیە دوو بیدعە نابێ دووبارە بکرێتەوە :

یەک / بیدعەی معاویە کە خرۆجی کرد لە شوڕای مسوڵمانان

. دوو / بیدعەی محمدی کوڕی عبدالوهاب کە خرۆجی کرد لەدەوڵەتی ئیسلامی عوسمانی

## : پوختەی سیویەک

### : شەڕی دینەکان ڕەوتی عەلمانی

عەلمانی سەرەتا لەئەوروپا سەری هەڵدا بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ پەیمانی (وێستڤالیا) کرۆکی ئەم پەیمانە بریتی بوو لە بەر تەسک کردنەوەی دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆر و دروست کردنی درزێک لەبەینی دەسەڵات و دینی مەسیحی ، دواتر بووە بانگەشەیەک لەناو کۆمەڵگا بۆ دوور خستنەوەی دینی مەسیحی لە دەسەڵات . واتا (فصل الدین عن الدولة) مەبەست لێی جیاکردنەوەی دینی مەسیحی بوو لە دەوڵەت ، کاتێ ئەم فکرەیە وەکو شۆڕشێک تەقیەوە لەڕوی دەسەڵاتی مەسیحی لەنەتیجەی ئەمە بوو کە دەسەڵاتی مەسیحی ستەمێکی زۆری چەند ساڵەی هەبوو بەرانمبەر خەڵک

پاش ڕوخانی دەوڵەتی ئیسلامی عوسمانی بۆ یەکەم جار فکرەی عەلمانی دابەزیە نێو جیهانی ئیسلامی ، بەڵام ئەم عەلمانیەی ڕۆژهەڵات جیابو لە عەلمانی ڕۆژئاوا ... عەلمانی ڕۆژهەڵات بریتی بوو لە ئاراستەیەکی ئلحادی ، بۆیە کەوتنە دژایەتی کردنی دینی ئیسلام تا ئەو ئاستەی توانایان هەبوو ، بەڵام لەڕۆژ ئاوا کە دایکی عەلمانیە ، عەلمانی وەک سیستەمێکی سیاسی کەوتە دەسەڵات لەهەمان کات کەنیسە حورمەتی خۆی هەبو لای دەسەڵات ... لەهیچ کاتێ کۆمەڵگای مسوڵمان هەڵنەستاوەتەوە بەرانبەر دەسەڵات چونکە ئەگەر دەسەڵات لێرەو لەوێ گەندەڵیشی هەبووبێ بەڵام ستەمی نەبووە ... بۆیە ئەوکاتەی دەسەڵاتی ئیسلام لەم ناوچەیە هەبوو ڕۆژئاوا لەتاریکترین سەدەکانی ژیان بوو بەهۆی کوشتار و برسیەتی

کۆپی کردن لەسیاسەت هەڵەیە چونکە سیاسەت بەپێی واقع و کۆمەڵگا دەکرێ ، هەر واقعێک و کۆمەڵگایەک تەبیعەتی خۆی هەیە ، کۆمەڵگای ڕۆژئاوا جیایە لە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵات ، هەڵەیەکی گەورەیە کۆپی سیستەمی سیاسی ڕۆژئاوا بکرێ لەسەر ڕۆژهەڵات ، لەوکاتەی ڕەوتی عەلمانی کەوتۆتە ڕۆژهەڵات ستەم و دەسەڵات بونەتە برا لەپاڵ ئەوەی گشت دەسەڵاتەکانی ڕۆژهەڵات لەوپەڕی زەلیلی و دواکەوتویی دان بەرانمبەر ڕۆژئاوا .

**:پوختەی سیودوو**

## :شەڕی دینەکان تۆڕی ئابوری جیهانی

ئادەمیزاد لەڕوی سیستەمەوە لەسەرەتاوە تاکو ئێستا بەچەند مەرحەلەیەک تێپەڕیوە ، مەرحەلەی خێزان ، مەرحەلەی خانەوادە ، مەرحەلەی خێڵ ، مەرحەلەی دەوڵەت ، لەهەر یەک لە مەرحەلەی خێزان و خانەوادە و خێڵ سیستەمێک هەبوە بۆ پەیرەوی لێ کردن وە یاسایەک هەبووە بۆ سنورد‌انان واتا هۆکاری سەرەکی دروست کردنی سیستەم بۆ بەدەستهێنانی ئابوریە و یاساش بۆ زەوت نەکردنی ئابوریە بەم پرۆسەیە دەوترێ ڕەوشت *ڕەوشت لەسیاسەت بوونی نیە ئەگەر سیاسەت بنەما نەکرابوو لەسەر مەبدەء ... (ئەگەر دین بنەمای سیاسەت نەبوو ڕوانینی سەرەکی ئادەمیزاد دەبێتە ئابوری ، ئەگەر ئابوری بەدەست هێنا هێزێک دروست دەکا بۆ بەدەست هێنانی زیاتری ئابوری کەواتە چەندە ئابوری بەهێز بێت ئەوەندە زیاتر زەوتی ئابوری بەرانبەر دەکا ..

کەواتە لەڕوی واقعیەوە سنوری هەر دەوڵەتێک لەو شوێنە ڕادەوەستێ کە ئابوریەکەی بڕی ناکا (کاتێ باسی ئابوری دەکرێ لەچوارچێوەی سیستەم واتا هێز) ئابوری ئادەمیزاد بەچەند مەرحەلەیەک گوزەری کردووە ( ڕاو،کشتوکاڵ ، پیشەسازی) لەمەرحەلەی ڕاو ئاڵوگۆڕی ئابوری وجودی نەبوو مرۆڤ ناوچەیی ژیانی بەسەر دەبرد ، لەمەرحەلەی کشتوکاڵ ئاڵوگۆڕی ئابوری بەشێوەیەکی سەرەتایی دەستی پێکرد ، کاتێ پیشەسازی هاتە کایەوە ئاڵوگۆڕی ئابوری ڕویدا لەنێوان ناوچەکان ،لەو مەرحەلەیە دراو دەوری بینی تێیدا ، دراوی ئەوکات زێڕ بوو بۆیە هیچ لایەنێ نەیدەتوانی یاری بە ئابوری ئەوەی دیکە بکا ...

لەکاتی ئمپراتۆری ڕۆمان و فارس چەند ناوچەیەک هەبوون لەسەر سیستەمی خێڵەکی دەژیان ، ئەم دوو ئمپراتۆریەتە کۆنترۆڵی ئابوری ناوچەکانی ژێر دەستی خۆیان کربوو خەڵکی لەزێقەتی دەژیا ، دوای دروست بوونی دەوڵەتی ئیسلامی ، ئابوری ئەو بەشەی جیهانی ئیسلامی ئازادی فراوان بوو بەهۆی دوو هۆکار ،

یەکەم ئیسلام ئیحترامی مولکی تاک دەگرێ

دووەم زەکات لەسەر ماڵ

واتا لەئیسلام سنور بۆ دەوڵەمەند دانراوە لە غرور بوون و ئیستغلال ، حەق فەقیریش دیاری کراوە بەڵام لە ئمپراتۆری ڕۆمان و فارس دەوڵەمەند هاوڵاتی دەرەجە یەک بوو ، لەم سەردەمەش دەوڵەمەند هاوڵاتی دەرەجە یەکە بەڵام بەتەعبیری جیا ... دوای جەنگی دووەمی جیهانی نەتەوە یەکگرتوەکان دروست کرا ، لەم ڕێکخراوە پێنج وڵات کۆنترۆڵی ئابوری جیهانیان کردیە تاکو ئێستا هیچ سوچێ نەماوە کۆنترۆڵیان نەکردبێ ...چوار وڵاتی مەسیحی و وڵاتێکی شیوعی بوزی ...، لەم

دەستەی بەڕێوەبردنەی جیهان دا ، شتێک نیە بەناوی ڕەوشتی دادپەروەری بەڵکو وەکو گەلە شێرێکن ولآتانیش وەکو نێچیر

بۆیە وەکو ١٤٠٠ سڵاڵ پێش ئێستا دیسان جیهان پێویستی بە کیانێکی ئیسلامی هەیە تاکو تەوازن بگەڕێنتەوە بۆ ئابوری جیهان.

## پوختەی سیوسێ:

## شەڕی دینەکان :

هاوپیمانی نێوان ئیشتراکی و سەرمایەداری:

دوای ڕووخانی دەوڵەتی ئیسلامی مسوڵمانان بۆ چەند دەیەیەک کەوتنە مت بوون ، ڕۆژ ئاوا ئەم ترسەی لەکۆڵ بوویەوە ، بۆیە کەوتنە شەڕێکی ناوەخۆ لەنێوان سیستەمی سەرمایەداری ئەمریکی و سیستەمی ئیشتراکی یەکێتی سۆڤیەت ... دواتر ئیسلامیەکان کەوتنە فێڵێکی ڕۆژئاوا ئەمیش خەریک کردنی مسوڵمانان بە گروپی جیهادی (ئەم فێڵە لەسەردەمی کارتر لەلایەن بریجنسکی پێشنیار کرا دواتر ڕیگن کردیە واقع) ئەمەبوو لەگەڵ مخابەڕاتی سعودی تاکی مسوڵمانیان هاندا بۆ هەڵگرتنی چەک دژی یەکێتی سۆڤیەت لە ئەڤغانستان *تا ئەوکاتە جیهان لە شەڕی ساردبوو لەنێوان ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت ، بەشێکی شەڕی سارد بریتی بوو لە جەنگ بە وەکالەت* ، ئەم پلانەی ئەمریکا سەری گرت بۆ کشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت لە ئەڤغانستان . دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشاوە جیهان بۆ دوو دەیە کەوتە ژێر قیادەی ئەمریکا (تاک جەمسەری) ، لەم کاتە جەماعاتە جیهادیەکان دژایەتی ئەمریکایان کەوتە مێشک لەکاتێ هەڵکەوتەی جوگرافی ئەمریکا گونجاوترین هەڵکەوتنە لەسەر ئاستی ولآتان بۆ جەنگ بێجگە لە هێزی ئابوری و سەربازی و تەکنەلۆجی لەپاڵ کۆنترۆڵ کردنی سەرۆکەکانی جیهانی ئیسلامی ، ڕۆژئاوا بەردەوام (اختراق و استدراج)ی جەماعاتی جیهادی دەکرد دواتر ئەم جەماعەتانە بوونە دەلیلێک بۆ پێکانی هەدەفی ڕۆژئاوا (ذریعة).

ئێستا فکرە ڕاست و سەرەکیەکە گەڕاوەتەوە نێو بەشێکی مسوڵمانان ئەمیش دروست کردنی کیانێکی ئیسلامیە لەبەرانبەر حەزارەتی ڕۆژئاوا لەم کاتە سیستەمە دژەوانەکانی ڕۆژئاوا کە ڕۆژگارێک شەڕو شۆڕشیان بوو دژی یەکتر بوونەتە هاوپەیمان چونکە هەست بەخەتەرە گەورەکە دەکەن کەحەزارەی ئیسلامیە..

## پوختەی سیو چار:

**: شەڕی دینەکان**

کارکردن لەسەر مستەوای وڵات ؟ یان جەماعات ؟

دروست کردنی هەر جەماعەتێکی چەکداری ئیسلامی ، دەعوە لەو ناوچەیە بۆ ١٠ ساڵ دەگەڕێنێتە دواوە ؟ لەکۆتایی ساڵانی شەستەکان فکرەیەک هاتە ناو دەعوەی ئیسلامی ، ئەمیش بریتی بوو لە دروست کردنی جەماعەتی جیهادی

لەفەترەی مەککە پێغەمبەر و هاوەڵانی خەریکی بانگەواز بوون ، پاش ئەوەی بانگەوازیان ئاشکرا کرد سەرانی قورەیش دەستیان کرد بەلێدان و کوشتنی مسوڵمانان ، پاشان هۆزی ئەبو تاڵیبیان خستە حصارِ ، بەڵام هیچ کاتێ پێغەمبەر بیری لە دروست کردنی جەماعەتێکی چەکداری نەکردەوە بەڵکو لەهەوڵی دروست کردنی کیانێک بوو ، ئەمەبوو هیجرەتی کرد بۆ مەدینە لەوێ کیانێکی دروست کرد بۆ مسوڵمانان

( کیان بریتیە لە سنور ، دین ، هێز

* هێز بریتیە لە سەربازی و ئابوری*

ئەم سێ کوچکەیە حەزارەت دروست دەکا) ئەمە بوو دواتر حەزارەی ئیسلامی دروست بوو ... خەریک کردنی مسوڵمانان بەدروست کردنی جەماعەتێکی چەکداری لەسوچێکی بیابان یان لەبناری شاخێک یان لە تەنزیمێکی نهێنی : بریتیە لە ئاسنی سارد کوتان ، لەنەتیجەی تەجروبە گشت جەماعەتە جیهادیەکان شکستیان هێنا ، دووبارە کردنەوەی تەجروبەیەکی شکست خواردوو هەمان نەتیجەیە . کەواتە ئەوەی گرنگە مسوڵمانان لەسەر سوننەتی پێغەمبەر کار بکەن کە بریتیە لە دەعوە بۆ دروست کردنی حەزارەتی ئیسلامی چونکە ئێستا رۆژئاوا حەزارەتە وەگشت دینەکان چونەتە ژێر چەتری حەزارەتی رۆژئاوا هاوپەیمانیەک دروست بوە لەنێوان رۆژئاوا و دینەکان لەبەرانبەر دینی ئیسلام

ئێستا ئیسلام لە غیابی حەزارەتە کەواتە شەڕی حەزارەت بەحەزارەت دەکرێ بۆیە مسوڵمانان دەبێ فکرەی جەماعات لە مێشکیان دەربینن روانگەیان بکەوێتە سەر دەوڵەت ، جەماعەتەکەی ئەبو بەصیر حالەتێکی کاتی بوو بەهۆی ئەوەی پێغەمبەر لە صولحی حودەیبیە بوو لەگەڵ قورەیش ، یەک لەخاڵەکانی ئەو پەیمانە وەرنەگرتنی مسوڵمانان بوو لە لایەن پێغەمبەر ... کەواتە

مسوڵمانان دەبێ ئقتدا بە سونەتی پێغەمبەر بکەن نەک ئەبو بەصیر ، تەنها کاتێ کە مسوڵمانان ، مسوڵمان بوون و دەعوەیان لێ قەدەغە کرابێ

بۆیە مەڕاحلی کارکردن بۆ ئیسلام بریتیە

یەک/ دەعوە

دوو / هیجرە : هیجرە لەکاتێ دەکرێ ئەگەر ڕێگای عیبادەت و دەعوە گیرا

سێ / جیهاد / جیهاد لەچوارچێوەی سیستەمێک دەکرێ نەک جەماعەتێک

# بەشی نۆ

## :پوختەی سیوپێنج

# قائد کێیە

قائد جیایە لە ڕەئیس

قائد هەڵکەوتنی کەسێکە لەزڕوفێکی هەستیار ، مەبەست لە زڕوفی هەستیار شۆڕشێکی فکری چەکداری یا دەعەویە

ڕەئیس هەڵبژاردنی کەسێکە لەپرۆسەیەکی دیموکراسی

صیفەتەکانی قائد

١ .خاوەن بڕیار/ واتا لەکاتی خۆی بڕیار دەدا بێ دوو دڵی

٢ .چاو نەترس / واتا کە هەنگاوی نا ئاوڕ لەدواوە ناداتەوە

٣ .کاریزما / واتا خاوەن گوێڕایەڵی و خۆشەویستی شوێنکەوتوانیەتی

صیفاتەکانی قائد زاتیە واتا (مکتسب) نیە مەرج نیە قائد هەموو جار لەبڕیارەکانی بپێکێ و سەرکەوێ بۆ نمونە (ابو بکر) و (عمر) و (عثمان) و (علی) ڕەزای خودایان لێبێت :

کاتێ ابوبکر دەبێتە خەلیفە گەورەترین و فراوانترین فتنە ڕوو لە دەسەڵاتی ئیسلامی دەکا کە بریتیە لە هەڵگەڕاوەکان ، لەم کاتە (عمر) و گشت صەحابە نزیکەکانی پێغەمبەر ڕایان ئاوابوو کە بەرانبەر بەشێک لەوانەی قەتعی زەکاتیان کردیە شەڕ نەکەن ، ابوبکر فەرمووی (اینقص الدين وانا حي) لەوکاتە اوبکر *خاوەن بڕیار بوو ، چاو نەترس بوو ، وە کاریزماش بوو * وتی ئەگەر لەئێستاوە نەرمی بنوێنین بەرانبەر ئەم هەڵگەڕاوانە ئەوا هەڵگەڕانەوە دەبێتە دیاردەو شکۆی دەوڵەت دەشکێ و قەواعدی ئیسلامی بێ ڕێز دەبێ ، ئەمە لەکاتێ ابوبکر بەنەرمو نیانی ناسرابوو بەڵام کەبووە خەلیفە لەکاتی پێویست توندترین بڕیاری داکە گشت صەحابەکان پێیان سەیربوو ئەمە ابوبکر)ە ، بۆیە عمر وتی چۆن کەسانێ دەکوژی کە دەڵێن لااله الا الله ابوبکر وتی نایانکوژم بەڵکو شەڕیان لەگەڵ دەکەم بۆ شکۆی دەسەڵاتی ئیسلام و گەڕاندنەوەی حەق ، پاشان عمر وتی بەڕاستی ئەگەر تۆ نەبای دەسەڵاتی ئیسلام پەرت و لاواز دەبوو

(عمری کوڕی خطاب) کاتێ بووە خەلیفە خاوەن بڕیار بوو ، ڕاستەوخۆ خالیدی کوڕی وەلیدی لادا لە ئەمیراتی جەیش کە خالد شمشێری خودا بوو وە دەستێکی باڵای هەبوو لە فەتح کردنی شام ، وە زۆری صەحابەکان وتیان پێمان باشە لای نەدەی بەڵام (عمر) وتی خالد دەیهەوێ لەبڕیاری خەلیفە دەربچێ و بەگوێی خۆی بکا ، وە خەڵک تەوەکولیان کەوتۆتە سەر خالد

(عوسمانی کوڕی عەفان) کاتێ بووە خەلیفە فتنەی مونافق و دەرچووەکان (خەوارج) دروست بوو دەیانووت دەبێ عوسمان واز لەدەسەڵاتی خەلیفە بهێنێ لەوکات (عوسمان) لەجیاتی ئەوەی جاڕی شەڕ بدا بەرانمبەریان تەمبێیان بکا کەچی هەڵسا بە خیطابێکی عاطفی دینی بۆیان کە ئەوان گوێیان پێ نەدا ، ئاخەر چۆن دەبێ کەسی یەکەمی دەسەڵاتێک کە سنورەکەی لەهەموو دەوڵەتەکانی ئێستا فراوانترە لەناو ماڵەکەی بەبێ کەسی بکوژرێ!

(علی کوڕی ئەبو طالب) کاتێ بووە خەلیفە معاویە بەیعەی پێ نەدا ، ئەمەبوو (علی) بڕیاری دا بەدروستکردنی جەیشێک و گواستنەوەی مەرکەزی خیلافە بۆ کوفە ، لەگواستنەوەی مەرکەزی خیلافە دوو هۆکار هەبوو یەکیان خەڵکی مەدینە و هاوەڵان پشتگیری علي)ان نەکرد وە ئیمام علي دەویست شەڕ و کێشە لەشاری پێغەمبەر دوور بێت

ئیمام علی خاوەن بڕیار بوو وەجەربێ بوو بۆ گەڕاندنەوەی حەق)بۆیە دوو شەڕی کرد )
بەسەرکەوتویی (جەمەل و نەهرەوان) ئەگەر پیلانی مونافقان نەبوایە بەشەهید کردنی علي دواتر شکستی بە معاویە دەهێنا بەڵام دوای ئەوەی علی شەهید کرا وە طەلحە و زوبیر شەهید کران وەپێش ئەوانە صەحابە بەتواناکانی مەیدانی سیاسەت و جەنگ وەفاتیان کردبوو ئیتر ساحەکە بۆ معاویە مایەوە ... بەڵام تاکە خاڵێکی لاوازی علی ڕەزای خودای لێێ نەیتوانی ڕاستەوخۆ بڕیاری قصاص بداکە طەلحە و زوبەیر و عائشە داوایان دەکرد ، ئەو هۆکارەبوو وای کرد معاویە بەڕوی بوەستێتەوە

هەڵکەوتەی بیئەو چۆنیەتی کەسانی دەوروبەر تەئسیر لەبڕیار و توانای قائد دەکەن ، بۆ نمونە ابو بکر (عمر و عثمان و علی) لەپشت بوو ، عمر (علی و عثمان) ی لەپشت بوو ، عثمان تەنها علی لەپشت بوو ، علی بێ کەس ماوە ... ، هەڵکەوتەی بیئەی ابو بکر و عمر هەڵکەوتەیەکی ئیمانی و

سوننەتی بوو موونافق و خەوارج دروست نەبوبوون .. پاشان ابو بكر و عمر دوو نزیکترین کەسی پێغەمبەر بوون ، پێغەمبەر کەفالەتی کردوون دەفەرمووێ (اقتدو باللذين من بعدي ابو بكر و عمر) . کەواتە خاڵی بەهێزی قائد بریتیە لە دیقەت بۆ ڕوداوە هەستیارەکان و ئاراستە کردنی بڕیاڕی کۆتایی و بوێری هەنگاو لەپاڵ جۆری بیئەو جۆری مستەواو دڵسۆزی کەسانی دەوروبەری.

# قیادە

قیادە بە وجودی پێنج بنەما سەرکەوتوو دەبێ یەک

یەک / زمانێکی پاراو

دوو / شمشێریکی تیژ

سێ / دەستیکی کراوە

چار / بیرێکی دووربین

پێنج / ئیمانێکی پتەو

زمان نابێ شمشێر کۆر بکا ، شمشێریش نابێ زمان ببڕێ ... ئیمان نابێ بیرکۆڵ بکا لەپیلان ، بیریش نابێ ئیمان بەزایە بدا ... دەست نابێ تەنها شمشێر بگرێ ، بەدەستێ شمشێرو بەدەستێک بەخشین ... بۆ نمونە لەزەمەنی خیلافی بەینی معاویەو ئیمام علی ڕەزای خودای لێبێ ... طەڕەفی شام دوو کەس قیادەی دەکردن (معاویە و عەمرێ کوڕی عاص) کە دوور بین و شمشێر لەدەستو زمان پاراو بوون ...، کاتێ لە شەڕی صفین خەریک بوو طەڕەفی شام بشکێ ... لەم نێوەندە معاویەو عەمرێ کوڕی عاص قورئانیان بەرز کردەوە وتیان با قورئان حەکەم بێت لەنێوانمان و شەڕ ڕاگرین ... ئیمام علی بەهۆی ئەوەی ئیمان وتەقوای زاڵ بوو بەسەر بڕیاری سیاسی قبوڵی ئەم پێشنیارەی کرد کە لەقازانجی طەڕەفی شام بوو ... بۆ نمونە معاویە پێشنیاری دروستکردنی چەند بەلەمێکی گەورەی کرد بۆ دروستکردنی هێزی دەریایی دەوڵەتی ئیسلامی ... بەڵام ئیمام عمر ئەم پێشنیارەی ڕەد کردەوە وتی ئەمە لەوانەیە ببێتە هۆی مردنی سەربازێکی زۆری مسوڵمانان ... کەواتە (ورع و تەقوی) لەکاتی قیادە کردن لەلاییێکی دڵت دادەنرێ ئەو لەتەی دیکەی دڵ بۆ پیلان و گورز وەشاندن و دەرفەت قۆستنەوە بەکاردێت...

## پوختەی سیو حەفت:

بیر تیژی و ئیمانداری و لێهاتوویی لەقالبی بەرپرسیارێتیدا

لەیەکەم شەڕی مسوڵمانان بەرانبەر ڕۆمەکان عەمری کوڕی عاص و ئەبو عوبەیدەی جەڕاح سەرکردایەتیان دەکرد ، ابو بکر خەلیفەی مسوڵمانان خالیدی کوڕی وەلیدی ڕاسپارد بەسەرکردایەتی کردنی ئەم جەیشە ، عمر ی کوڕی خطاب وتی ئەی ابو بکر خالید دەکەیە سەرکردەی کەسێ کە ئەمینی ئوممەیە (پێغەمبەری خودا ابو عبیدە ی بە ئەمینی ئوممە ناساند) ابو بکر وتی بەڵێ ئەگەر من و تۆش بین ... ابو بکر وتی ابو عبیدە لەمردن ناترسێ بەڵام کەسێکی دڵ نەرمە موراعاتی زۆر شت دەکا ، عەمری کوڕی عاص کەسێکی بیر تیژە ئەم بیر تیژیەی وای لێدەکا هەندێ جار خوێندنەوە بۆ پێشهاتی زیاتر بکا کە ئەمەش دوای دەخا لە بڕیاردان بەڵام خالد کەسێکی جەریئەو شارەزایە لەشەڕ .

جورئەت واتا توانای بڕیاردان چ لەسەرخۆت چ لەسەر بەرانبەر کەواتە (لکل مقام مقال) هەندێ کەس هەن شایستەن بۆ وەرگرتنی پۆست ئەگەرچی لەفەزڵ لەدواوە بن ، بۆ نمونە بیلالی حەبەشی لەسابقینە بەڵام تا وەفاتی کرد پۆستێکی پێ نەدرا چونکە دەزانرا توانای ئەوکارەی نیە وە خۆشی داوای پۆستی نەکرد چونکە دەیزانی توانای پۆستی نیە ، بەڵام کەسێکی وەکو عەمری کوڕی عاص کە لەدوای بەدر و ئوحد و خەندەق و بەیعەی رضوان مسوڵمان بوو بەڵام دەکرێتە ئەمیر لە مصر چونکە لەو ڕووەوە بەتوانایە ... عەمر لەسەردەمی لاوێتی ڕەفاقەتی لەگەڵ پاشای حەبەشە نەجاشی هەبوو

بەڵام لەکاتی دەستنیشان کردنی کەسی لێهاتوو بۆ پۆستێک نابێ دەرفەتی ئەوەی پێ بدرێ طموحی زۆرتری بۆ دروست بێ بەڵکو دەبێ هەمووکات ئەو جۆرە کەسانە بەسەرکردەسەکی دیکە ببەسترێتەوە بۆ ئەوەی تەشتیتی طموحی بکرێ .. چونکە خلقەتی ئینسان وایە لەدوای هەر دەستکەوتێک حەزی زیاتری دەبێ.

## :پوختەی سیو هەشت

لكل امة اجل

چۆن ئینسانەکان ئەجەلێکی دیاریکراویان  هەیە ئاواش کیان و دەوڵەت ئەجەلی هەیە

امة واتا دەسەڵاتێک لەسەر ڕێڕەوی مەنهەجێک ( مەنهەجی ئیسلامی ، مەنهەجی عەلمانی ، مەنهەجی صەهیۆنی ، مەنهەجی شیوعی ... ) هەریەکێ لەو دەسەڵاتانە کۆتاییەکیان هەیە ئەمە سوننەتی خودایە بۆ ئینسان (فلن تجد لسنة الله  تبديلا) سونەتی خودا بۆ ئینسان و کەون ناگۆڕێ تاکو ئەو ڕۆژەی کە نیشانە گەورەکانی قیامەت دەست پێ دەکا ( يوم يأتي بعض آيات ربك لا ينفع نفسا إيمانها) هەرکاتێ دەرگای ئیمان داخرا ئیتر سوننەتی کەون تێک دەچێ عاقیبەت دەکەوێتە دەست سیستەمی ئیسلامی (ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر أن الأرض يرثها عبادي الصالحون) بۆ نمونە سیستەمی ئیسلامی کە بەدرێژایی هەزار ساڵ حوکمڕانی کرد بەڵام لەکۆتاییەکەی ئەجەلی هات ،،، فارسە ساسانیەکان ، ڕۆمەکان ، ئمپڕاتۆریەتی ڕۆمانیای موقەددەس ، سیستەمی مەلەکی وڵاتانی ئەوروپا ، داگیرکاری فەڕەنسا و بەریتانیاو ئیتالیاو پرتوگال هەریەک لەمانە ئەجەلیان هات ...ئێستا نۆرەی ئەمریکاو ڕوسیایە کە ڕۆژێ دێت ئەجەلیان دێت

## :یوختەی سیو نۆ

### جیهاد لەژێر قیادەیەکی مەرکەزی دەکرێ

پێغەمبەرصلی الله علیە وسلم دەفەرموێ : ألا أخبرُكَ بِرَأسِ الأَمرِ كلِّهِ وعمودِهِ وذِروةِ سَنامِهِ؟ قلتُ: بلى يا رسولَ اللَّهِ، قالَ: رأسُ الأمرِ الإسلامُ، وعمودُهُ الصَّلاةُ، وذروةُ سَنامِهِ الجِهادُ) لوتکەی بڕیار بریتیە لە ئیسلام (چونکە لێپرسینەوەی کوفرو ئیمانی قیامەت لەسەر ئیسلامە) ، کۆڵەگەی ئیسلام بریتیە لە نوێژ (چونکە فەرقی بەینی مسوڵمان و غەیرە مسوڵمان بریتیە لە نوێژ کردن) ، شکۆی ئیسلام بریتیە لە جیهاد (چونکە مست لەدرێشە دەگەڕێتەوە) پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەفەرموێ (من مات ولیس علی عنقە بیعة مات میتة جاهلیة) هەر کەسێ مرد بەیعەی نەدا بەدەسەڵاتدار ئەوا بەمردنێکی جاهلی مردووە . مەبەست لەدەسەڵاتدار واتا (وان امر علیکم عبد حبشي ماأقیم فیکم کتاب الله)

جیهاد بنەمای هەیە ، واتا ناکرێ هەر کۆمەڵێ کۆببنەوە دەست بکەن بە تەقە کردن ناو لەمە بنێن جیهاد ، بەڵکو جیهاد بریتیە لەجەنگێک لەژێر قیادەیەکی مەرکەزی . کەواتە جیهاد لەوجودی بەیعە دەبێتە ئەرک

بنەماکانی بەیعە :

یەک / وجودی سنورێکی دیارکراو (دەوڵەت)

دوو / ئەم سنورە پابەند بێت بەحوکمی قورئان

سێ / وجودی سەرۆکێکی باوەڕ پێکراوی مسوڵمانان .

## :پوختەی چل

## ڕوح

سوننەتی ژیان ئاوایە چاو مەرگی ئەزیزان دەبینێ , لەو حالەتە چاوەکان فرمێسک دەڕێژن
دڵەکانیش تەنگ دەبن بەڵام شتێک ناڵێین ڕەزای خودای لەسەر نەبێ ئینسان لەدونیا
بەجەستەیەکی هەستیار بوونی هەیە , مەرگ بریتیە لە باطل کردنەوەی ئەم جەستە هەستیارە
بەکێشانی ڕوح تێیدا ، ڕوح واتا ژیان , ڕوح هی خودایە , خوای گەورە ژیانی بێ سەرەتاو بێ کۆتای
هەیە , لەو بەشە ژیانەی خۆی بەشێکی داوە بە ئینسانو زیندەوەرانی دیکە ... دەفەرموێ (ونفخت
فيه من روحي) روح نامرێ , واتا خودای گەورە لەوەتەی ئینسانی دروست کردووە ژیانی پێداوە ,
لەکاتی مردنی لاشە روح دەچێتە عالەمێک پێی دەڵێن بەرزەخ ، لەبەرزەخ عەیش و نۆش و عەزاب
هەیە خودای گەورە دەفەرموێ ( فأما إن كان من المقربين فروح وريحان وجنة نعيم) روحی
چاکەکار کاتێ لاشە بەجێدێڵێ لەبەرزەخ ژیانێکی خۆشی هەیە ... دەربارەی خراپەکاری بێدین خودای
گەورە دەفەرموێ (مما خطيئاتهم أغرقوا فأدخلوا نارا ) هەرکاتێ مردن عەزاب دەدرێن بەڵام ژیانی
بەرزەخ تەنها بە گشتی باسی لێوە کرایە جوزئیاتی باس نەکرایە کەواتە ڕوح عالەمێکی غەیبە خودای
گەورە تەفاصیلی نەدایە لەسەر روح بەڵام لەدونیا ڕوح پەیوەستە بەلاشە , لەبەرزەخ تەنها ڕوح
.تەعاملی لەگەڵ دەکرێ بێ لاشە , لەقیامەت لاشەیەکی نوێ لەبەر ڕوح دەکرێتەوە

لەهیچ کام لەم مەرحەلانە ڕوح نامرێ .

## پوختەی چلویەک:

ئیستفادە لەزانستی ڕۆژئاوا

ئیستفادە لەزانستی ڕۆژئاوا بکە ، زانست لەگواستنەوە دایە لەنێوان گەلانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات ، بگەڕێینەوە چەند هەزار ساڵێک پێش ئێستا سەردەمی فیرعەونەکانی مصر ، ئەوکات هەرەمەکان دروست کران و بورج دروست دەکرا و مۆمیا بۆ لاشەی فیرعەونە مردووەکان بەکاردهێنرا : ئێستا جێگای سەرسوڕمانی زانستە ... وە لە وڵاتی نێوان دوو ئاوەکە حەزارەی کلدانی و ئاشوری ... سەردەمی عەباسی و عوسمانیەکان سەردەمی زێڕینی دەرکەوتنی زانایانی ئیسلام بو لەڕووی بیرکاری و پزیشکی و کۆمەڵناسی ... خودای گەورە دەفەرموێ (سخر لكم ما في السماوات وما في الارض جميعا) هەرچی لە ئاسمان و زەویە بۆ ئێوەم فەراهەم کردووە تاکو دەستان پێی بگا (لە قورئان هەندێ ئایەت هەیە خودای گەورە بەعام دەفەرمووێ بەڵام مەبەست تێیدا تەخصیصە ، یا بەئایەتێکی دیکە خاص دەکرێ یاخود ماناکەی خاصی دەکا) بۆ نمونە ئەو ئایەتەی پێشو بەم ئەیەتە خاص دەکرێ : خودای گەورە دەفەرموێ ( يامعشر الجن والانس ان استطعتم ان تنفذو من اقطار السماوات فانفذو لاتنفذون الا بالسلطان ) دەفەرمووێ ئەی کۆمەڵی ئینسان و جنۆکە ئەگەر بتانهەوێ دەستتان بەسەرتاپای زەوی و ئاسمان بگا ئەوا ناتوانن کەواتە خودای گەورە زەوی و ئاسمانی بەشێوەیەکی جوزئی بۆ مرۆڤ و جنۆکە موسەخەر کردووە تاکو دەستیان پێ بگا ...ئەگینا هێشتا بەشێکی زەوی ماوە ئینسان و جنۆکە دەستیان پێی نەگەیشتووە وەپێشی ناگا . بۆیە زانستی ئینسان (مقصر)ە هیچ کات ناگاتە کەمال ، خودای گەورە دەفەرموێ (وما اوتيتم من العلم الا قليلا ) بۆ نمونە : ئایا ناسا دەتوانێ ڤیدیۆیەکی جوڵەی زەوی بەدەوری خۆی یاخود بەدەوری خۆر تۆمار بکا !؟ ، ئەگەر ئەوان لەساڵی 1967 چونەتە سەر مانگ ؟ بۆچی ئێستا کە گوایە لەلوتکەی گەشەی تەکنەلۆجیا دان سەفەرێکی سەر مانگ ناکەن !؟ کەواتە ئەو تەکنەلوجیایەی ئێستا لەڕۆژئاوا هەیە ئەگەر دەرفەت بدەنە گەلانی مسولمان ببنە خاوەن کیان ئەوکاتە لەوان لەپێشتر دەبن .

## : یوختەی چلودوو

## هیچ کات دامەبڕێ لەلایەنداری حەق

خالدی کوڕی وەلید و معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ، خالد ڕەزای خودای لێبێ پێش فەتحی مەککە مسوڵمان بوو ، لەفەتحی مەککە تاکە شەڕێک ڕوویدا لەو قوّڵە بوو کەخالد قیادەی دەکرد پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناوی نا شمشێری خودا ، خالد دەستێکی سەرەکی هەبوو لەتێک شکاندنی هەڵگەڕاوەکان بەتایبەت جەیشی موسەیلەمەی درۆزن ، دواتر چەند جەیشێکی فارسی تێک شکاند ، پاشان دەستێکی سەرەکی هەبوو لە ئازاد کردنی بەشێکی زۆری شام ... تا وای لێهات وتی بەشی بستێک لەلاشەم نەماوەتەوە بریندار نەبوبێ لەپێناو خودا ،،، لەگەڵ ئەو هەموو فەزڵە لەسەر دەسەڵاتی ئیسلام کاتێ عمر لە ئەمیراتی لای دەدا خالد ئەگەرچی لەدڵی گرانە بەڵام هیچ فتنەیەک و هەڵگەڕانەوەیەک دروست ناکا بەڵکو ڕاستەوخۆ تەسلیمی بڕیارەکە دەبێ و دەڵێ ئەمە بڕیاری خەلیفەی مسوڵمانانە ... خالد لەکاتی نەخۆش کەوتنی کە نەخۆشی مەرگ بوو وەصیەتی کرد ئەو کەلوپەلەی هەیتی لە شمشێرو چەند شتێک بەدیاری ببەن بۆ عمر وەدەڵێ سەلامی من بە عمر بگەینن ئیمام عمر کە خەبەری وەفاتی خالدی کوڕی وەلیدی بۆ هات ئەوەندە گریا کەوتە سەر چۆک پاشان وتی (مضو وخلفوني وحدي) پاشان فەرموی (عشت سعيدا ومت حميدا) ، پاشان خەبەریان بۆ هێنا وتیان ئافرەتانی مەدینە دەنگی گریانیان کۆڵانەکانی پڕ کردیە وتی لێیان گەڕێن با بگریێن ... معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ، دوای فەتحی مەککە مسوڵمان بوو ، ئەمانەی دوای فەتحی مەککە مسوڵمان بوون جیان لەوانەی پێش فەتحی مەککە مسوڵمان بوون خودای گەورە دەفەرموێ (لا يستوي منكم من أنفق من قبل الفتح وقاتل أولئك أعظم درجة من الذين أنفقوا من بعد) صەحابە لە ئیسلام واتا دۆست و پشتیوان و قوتابی پێغەمبەر ، ئەوەی دوای فەتحی مەککە مسوڵمان بووە نابێتە صەحابە بەڵکو تەنها مسوڵمانێکە لەسەر نیەتی خۆی . کەسێ کە لە سابقینە (هیجرەتی کردیە ، لە عەشەرە موبەشەرەیە ، لە ئەهلی بەدرە ، لە جەماعەتی بەیعەی رضوانە) چۆن موقارەنە دەکرێ بەکەسێ کە دوای فەتحی مەککە مسوڵمان بووە . پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ (أول هذا الأمر نبوة ورحمة ثم يكون خلافة ورحمة ثم ملكا ورحمة ثم إمارة ورحمة) معاویە خیلافەی گۆڕی بۆ (ملک) ، پێغەمبەر دەفەرمووێ (أول من يغير سنتي رجل من بني أميه) معاویە لە بەنی ئومەیەیە وە یەکەم کەس بو دەسەڵاتی لە شورا گۆڕی بۆ مولک ، پێغەمبەر دەفەرموێتە عەممار ڕەزای خودای لێبێ ( ويح عمار تقتله الفئة الباغيه) فیئەی باغی واتا دەستەیەکی دەرچوو لەشەرعیە (جەیشەکەی معاویە عەمارِیان کوشت) کەواتە ئەوەی دوای فەتحی مەککە مسوڵمان بوو لەوجودو دیتنی پێغەمبەر صەحابە نیە بەڵکو مسوڵمانێکە بەپێی سەعی خۆی

ناکرێ قیاسی علی کوڕی ئەبو طالب لەگەڵ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بکرێ چونکە علی هەڵبژاردەی شوراى صەحابە بوو وە لە سابقینە بەڵام معاویە خەلیفە عمر داینا بۆ والی شام ، وە لەدوای فەتحی مەککە مسوڵمان بوو ، معاویە هەڵگەڕاوە لەبەرانمبەر دەسەڵاتی خەلیفە ، وە شەڕی لەگەڵ کردو دواتر خۆی کردە خەلیفە دواتر پەیمانی شکاند دەسەڵاتی نەگەڕاندەوە شوڕا کوڕەکەی یەزیدی کردە جێنشینی خۆی ... بۆیە ئەگەر ئێمە لەو زروف بواین موکەلەف دەبووین وەک سەربازێک لەڕیزی علی جەنگابین بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی حەق (شوری) ، چونکە ئەمە کێشەیەک بوو لەسەر مستەوای شەرع نەوەک لەسەر مستەوای سیاسی دونیایی

سەلەفیەکانی سعودیا بەهۆی تەئسیراتی صیڕاعیان لەگەڵ شیعە بەشێوەیەکی عاطفی کەوتونەتە دیفاع لە معاویە ، بۆیە ابن عباس دوای ئەوەی بێ لایەنی هەڵبژارد ، پاشان وتی بریا ئەو بێ لایەنیەم هەڵنەبژاردبا کەواتە بەشێکی بڕیاری سیاسی ئیجتهادە مەرج نیە ئەوەی بڕیاری سیاسی مسوڵمانانی لەدەستە هەمووجار بپێکێ ، عمر ڕەزای خودای لێبێت خالدی کوڕی وەلیدی لادا لەبەر ئەوەی نەوەک ڕۆژەک خالد (تفرد) بکا ... پاش ماوەیەک معاویەی هەڵبژارد بۆ والی شام بەڵام لەکۆتاییەکەی معاویە (تفردی) کرد خیلافەی گۆڕی بۆ مولک ... لێرە خالد گوێڕایەڵی ئیمام عمر ی کرد بەڵام معاویە گوێڕایەڵی ئیمام علی نەکرد ( پێغەمبەر دەفەرموێ [من مات ولیس علی عنقه بیعه مات میتة جاهلیة]) ئەم حەدیسە مەبەست لێ کەسێکە ئەگەر بەیعەی نەدا پشێوی دروست دەبێ ، نەوەک کەسێکی سادە کەهیچ تەئسیراتێکی نیە ئەگەر بەیعەشی نەدا . لەکاتی ئیختلافی بەینی مسوڵمانان بێ لایەنی ناحەقیە بەڵکو دەبێ بەنیەتی پاک ئجتهاد بکەی بۆ هەڵبژاردنی لایەنی حەق (ئەگەر حەق ڕوون نەبوو لای کێیە) ، ئەگەر ڕوون بوو ئەوکاتە موکەلەفی بەلایەنداری لایەنی حەق .

نابێ لەکاتی باس کردنی مێژوو عوزر بۆ هەندێ بەسەرهات بهێنینەوە بەڵکو دەبێ وەک خۆی باسی بکەین ، خودای گەورە باسی موسا دەکا سەلامی خودای لێێ دەفەرموێ (فوکزه موسی فقضی علیه قال هذا من عمل الشیطان) ئعتراف بەهەڵە ئەرکێکی دینیە ، بەردەوام بوون لەسەر هەڵە تاوانە.

## پوختەی چلوسێ:

### تەنازول لەحەق بۆ ناحەق

بۆ ئەوەی خاوەن حەق کەمترین زەرەر هەڵبژێرێ چۆنیەتی گەڕاندنەوەی حەق لەنێوان ئیمام علي و حسين ی کوڕی .

خودای گەورە دەفەرموێ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) تەکلیفە لەسەر ئیمانداران گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بکەن و گوێڕایەڵی خاوەن بڕیاریان بکەن ، ئەگەر کێشمەکێش کەوتە بەینی مسوڵمانان لازمە بگەڕێنەوە بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی ئەگەر وایان نەکرد فەرمودەی خوداو پێغەمبەریان پشت گوێ خستیە . پاشان دەفەرموێ (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى امر الله) ئەگەر نیزاعی بەینی مسوڵمانان گەیشتە کوشتار ئەوا لایەنداری حەق بکەن چونکە حەق هیچ کات بزر نیە ، ئەگەر لایەنی ناحەق دانی نەنا بە حەق ئەوا کوشتاریان لەگەڵ بکەن تاکو دەگەڕێنەوە لای حەق .

لەژێر قاعیدەی ئەو دوو ئایەتە ئیمام علی فەرمانی دا بەشەڕ کردن لەگەڵ معاویە ، چونکە ئیمام علی هەڵبژەردەی شوڕا بوو (شورا واتا ئیجماع ، ئیجماع لە ئیسلام ئەمری سێیەمە واجبە گوێڕایەڵی کردنی )

دوای ئەوەی ئیمام علی شەهید کرا ، ئیتر شورا لەوجود نەما ، لەم نێوەندە خەڵکی عێراق پابەند بوون بە حسێن ی کوڕی علی ، لەم کاتە حسێن دەیتوانی شەڕی معاویە بکا بەڵام بەهۆی تەقوای خودا (کە سولطەی خۆش نەویست و ڕەچاوی سنوری دەوڵەتی ئیسلامی کرد کە دوژمن خۆی مەڵاس دایە ) بۆیە بوونی دەوڵەتی ئیسلامی پێ ئەولاتر بوو لەپەرتەوازەو شکستی ... لەبەر ئەمە حسێن تەنازولی کرد بۆ معاویە ، واتا تەنازول لەحەق بۆ ناحەق ، چونکە خاوەن حەق کەمترین زەرەری هەڵبژارد کەواتە ئەگەر نەتوانرا فیئەی باغی بگەڕێندرێتەوە لای حەق ئەوا تەنازول باشترە لە پەرتەوازە بوون ، چونکە کیان زەرورترە لەتاک...

## پوخته چلوچار:

## إله ، رب

اله / واتا پەرستشێک لەسەر بنەمای فەرمانڕەوا یان فەریادڕەس

فەرمانڕەوا واتا دەسەڵاتی سنورێک لەسەر دەستورێکی دیار (پەرستشی فەرمانڕەوا بریتیە لە *محبة و طاعة*)

فەریادڕەس واتا بەهاناهاتوو

رب واتا خاوەن (واتا خاوەنی شتێک کەخۆی دروستی کردووە)

لەسەرەتای دروست بوونی شیرک لەدڵ و کردەوەی ئینسان شیرک لە (اله ، الالوهیة)ڕوویداوە ، بۆیە گشت پێغەمبەران بانگی مللەتەکەیان کردووە بەم شێوەیە ( يا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ ما لَكُمْ مِنْ إِلهٍ غَيْرُهُ) کاتێ فیرعەون دەڵێ (انا ربكم الاعلى) مەبەستی ئەوەبوو کە من خاوەنی ئێوەم نەک خالقی ئێوە ... چونکە هیچ کەسێ باوەڕ بەوە ناکا مرۆڤێک خالق بێت ... بۆیە هیچ یەکێ لە فەرمانڕەوایانی موشریک بانگەشەی ئەوەیان نەکردیە کە خالق بوبێت چونکە ئەمە قسەیەکی پوچ و بێ بنەمایە سەرەتایی ترین مرۆڤ قەناعەت بەو بانگەشەیە ناکا ، بەڵام بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە گوێڕایەڵیان بن .. ئەمە (إله) لەبەشی فەرمەنڕەوایی

(إله) لەبەشی فەریادڕەس بریتیە لە وەسیلە ، وەسیلە بریتیە لەبەکارهێنانی مرۆڤێک یا قەبرێک یا پەیکەرێک ... بۆ نزیک بوونەوە لەخودا ، کاتێ خودای گەورە دەفەرمووێ (وابتغو اليه الوسيلة) مەبەست لێی کردەوەیە کە ببێتە هۆی نزیک بونەوەو لێخۆش بوون لای خودا ، بۆ نمونە خودای گەورە دەفەرمووێ (واسجد واقترب) سوجدە کردەوەیەکە کە مرۆڤ لەخودا نزیک دەکاتەوە

کەواتە (رب) کاتێ بۆ خودا بەکاردەهێنرێ واتا خالق و خاوەن ، بەڵام کاتێ بۆ مرۆڤ بەکاردەهێنرێ واتا خاوەن

(إله) کاتێ بۆ خالق بەکاردەهێنرێ واتا فەرمانڕەواو فەریادڕەس ، کاتێ ئەو دوو سیفەتەی یا یەکێ لەو دوو سیفەتە ڕازی بیت لە غەیری خودا ئەوە شیرکت ئەنجام داوە

## : پوختەی چلوپێنج

امة ، ملة ، قوم

ئەم سێ چەمکە مانای چیە لەقورئان ؟

امة/ واتا دەسەڵاتێکی سیاسی عەسکەری سنور دیار لەسەر ڕێبازێکی دیاریکراو (ومن قوم موسی امة یعدون بالحقي وبه یعدلون

ملة/ واتا کۆمەڵە کەسێک لەسەر ڕێبازێک بەبێ دەسەڵات وە بانگەشەکردنی ئەو کۆمەڵە کەسە بۆ ئەو ڕێبازە

قوم / واتا بەستانەوەی خەڵکانێک بەیەک زمان (وما أرسلنا من رسول إلا بلسان قومه)

امة و ملة / ئەصڵن لە ئیمان ، امة / پەیوەندی بە سمع و طاعەی تاک هەیە ، ملة / پەیوەندی بە جەماعەت هەیە ( هەر جەماعەتێکی دەعەوی جا حزب بێ یا غەیرە حزب بێت ئەوا بریتیە لە ملة ، قوم / پەیوەندی بە تەعارف هەیە (وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا) کەواتە تۆ لەهەر قەومێک .بیت دەبێ وەلائت لەسەر ئەساسی (امة و ملة) بێت

## پوختەی چلوشەش:

رخصة و عزيمة

رخصه له ئیسلام واتا رێگەدان بەکردنی گوناحێک لەکاتی ناچاری

عزیمه له ئیسلام واتا خۆڕاگری له نەکردنی گوناحێک ئەگەر ناچاری تێدا بێت ، ناچاری واتا پاڵەپەستۆیەک که تەئسیر لەسەر ئاراستەی ژیانی ئەو کەسه بکا خودای گەورە دەفەرموێ (مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ)

ئەگەر ڕوخصه بەکارهێنرا دەبێ دڵ پێی ناخۆش بێت . عزیمه کاری سەرەکی سەرکردەکانه تاکو ببنه سەرمەشق ، خودای گەورە دەفەرموێ (فاصبر كما صبر اولو العزم من الرسل) *نوح ، ئیبراهیم ، موسا ، عیسا ، محمد * سەلامی خودایان لەسەر بێت ئەو پێغەمبەرانه بوون که دەردی سەری زۆریان بینی لەدەست گەلەکانیان بەڵام صەبریان گرت بۆیه خودای گەورە دەفەرموێ شوێن سوننەتی ئەو پێغەمبەرانه بکەون کەواته عەزیمەت بریتیه لەهێزی ئەو ئیمانەی خۆڕاگری دروست دەکا لەبەردەم ئازارە زۆرەکان

بۆ نمونه سومەیه و یاسر عەزیمەیان بەکار هێنا

ڕوخصه بریتیه لەناچاری زمان لەبەر ئازاری لاشه بەنارازی دڵ ، بۆ نمونه عەممار (پێغەمبەر بەعەممارى فەرموو *فان عادو فعد* ئەگەر هاتنەوە بۆ ئازارت دیسان ئەوەی وتت بیڵێوە.

## پوختەی چلوحەفت:

طاغوت "

" فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى لا انفصام لها والله سميع عليم

هەرکەسێ کوفر بە طاغوت بکا وە ئیمان بەخودا بهێنێ ئەو کەسە دەستی بەو حەبلە گرتوە کە دەیگەیەنێتە بەهەشت ...

طاغوت لێرە واتا پەرستراو (دوو جۆر پەرستراو هەیە ، یەکیان بتەکان ، ئەوی دیکەیان گوێڕایەڵی لەغەیری فەرمانی خودا بۆ دژایەتی دینی خودا :

عبادة او طاعة او حبا سمي المطاع في الضلال ربا ، قال عدي لسنا نعبد قال النبي ليس هذا مقصد ، هي طاعة الاحبار فى التحليل كذاك في التجريم بالتضليل ، ئەمە بریتیە لە طاغوت لە عیبادەت (

بەڵام طاغوت لەحوکم شتێکی دیکەیە / خودای گەورە دەفەرموێ (الذين آمنوا يقاتلون في سبيل الله والذين كفروا يقاتلون في سبيل الطاغوت) کاتێ باسی قیتال دەکرێ واتا لەژێر ئاڵایەک ، ئەو ئاڵایە بریتیە لە دەسەڵات

خودای گەورە دەفەرمووێ (انا لما طغى الماء حملناكم في الجارية) طاغوت لەدەسەڵات واتا لەسەر ڕژان ، بەردەوامی زوڵم

(من لم يحكم بما انزل الله فؤلئك هم الظالمون) هەرکەسێ حوکم بە قورئان نەکا زاڵمە ... وەبەپێچەوانەوەشەوە زاڵم حوکمی قوڕئانی لێ وەرناگیرێ

واتا لە حوکم زاڵم طاغوتە وە طاغوت زاڵمە

طاغوت لێرە واتا ( من جاوز حده ) کەواتە (كل من جاوز المشروعا فإنه الطاغوت) بەردەوام بوون لەسەر کوشتن زوڵم و زەوت کردنی دەسەڵات بەناحەق

## پوختەی چلو هەشت:

سیاسەت لەئیسلام ، سیاسەت لە زمانەوانی

واتا / سیاسة الخیل ترویضها وتربیتها ( سەرەتا خەڵکی وشەی سیاسەتیان بۆ پەروەردە کردن و بەخێو کردنی سوار بەکار دەهێنا (ڕام کردن

سیاسەت لەئیسلام واتا ئیدارەدان (بەڕێوەبردن) (پێغەمبەر دەفەرمووێ (کانت بنو اسرائیل تسوسهم الانبیاء)

سیاسەت لە سەردەم :

دوو بەشە سیاسەت لە زانستی سیاسە واتا(تحلیل) واتا ( تفکیک الشئ وإعادة ترکیبها )

سیاسەت لە هەڵسوکەوتی نێودەوڵەتی واتا (کسب المنفعة علی حساب الاخر)

لەزەمەنێک کە وڵاتان پێکەوە گرێدراون لە هەڵسوکەوتی سیاسی و ئابوری عەسکەری ئەوا بوونی هەر قازانجێک لەسەر حیسابی بەرانبەرەکەیە ، کاتێ باسی سیاسەت دەکەین دەبێ بزانین سیاسەت دوو مقەومی هەیە ، یەکەم ئابوری ، دووەم عەسکەری ، لەم سەرەدەمە باس لە دبلۆماسی دەکرێ بەلام بەهێزترین زمانی دبلۆماسی لەسەر بەرانبەر زمانی ئابوری و عەسکەریە

ئایا ئابوری هێزی سەربازی دروست دەکا ؟ یان سەربازی هێزی ئابوری دروست دەکا ؟ مقەوماتی هێزی سەربازی بریتیە لە

یەک / مەوقعی جوغرافی

دوو / ژمارەی دانیشتوان

سێ / مەساحەی زەوی

چوار / شێوەی هەڵکەوتەی زەویەکە

پێنج / مقەوماتی ئابوری ، مقەوماتی ئابوری بریتیە لە یەک / مەوارد (نەوت و کانزاکان ، دوو / پیشەسازی ، سێ / سنوری ئاو

کەواتە ئەگەر مقەوماتەکانی هێزی سەربازی مەوجود نەبوو لە دەوڵەتێک ئەوا بەتەنیا ئابوری ناتوانێ هێزی سەربازی دروست بکا نمونە / ئیماراتی ، سعودیا ، دوو وڵاتی خاوەن هێزی ئابورین

بەلام بەهۆی ئەوەی مقەوماتی هێزی سەربازیان تێدا نیە ناتوانن ببنە خاوەن هێزێکی حیساب بۆکراو ... بۆ نمونە / ئەمریکا لەڕووی شوێن کەوتۆتە ناوچەیەک دەستی پێ ناگا (هەڵکەوتەی جوگرافی و ئابوری بەهێزی هەیە ، ژمارەی دانیشتوانی زۆرە ، مەساحەی زەویەکەی فراوانە ، سنوری ئاوی زۆرە ، ماددەی سروشتی هەیە ، پیشەسازی هەیە ...

بۆیە پڕە لە مقەوماتی هێزی سەربازی و ئابوری لەبەر ئەمە توانایەکی سەربازی دروست کردووە لەوەتای شەڕ دەکا گشت شەڕەکانی لەدەوەرەی کیشوەر و سنوری خۆیتی .

سیاسەت لە ئیسلام واتا ئیدارەدان وە سیاسەت لەم واقیعە واتا قازانج کردن ، ئیسلام لەسیاسەت بریتیە لەواقع کەواتە لە ئیسلام سیاسەت دابەش دەبێتە سەر سێ بەش /

یەکەم / ئیدارە (ئەمە تایبەتە بە ناوەخۆی وڵات

دووەم / پەیمان ( ئەمە بریتیە لە گۆڕینەوەی مەرج لەگەڵ بەرانبەر لەسەر ڕازیبونی هەردوولا (اوفو بالعهد)

سێیەم / خدعە (الحرب خدعة) سیاسەتی دەرەکی ئەگەر عەهد و عەقدی تێدا نەبوو ئەوا بریتیە لە جەنگ (لەبابەتی پێشو باسی جیاوازی نێوان صیراع و جەنگ)م کردیە وتومە جەنگ لەچاو لەناو چاوێکەوە دەست پێ دەکا تاکو شەڕە بۆمب ... ئەگەر لەسیاسەت شارەزاییت نەبوو هەم لەشەڕ دەدۆڕێی هەم لەئابوری دەدۆڕێی بۆیە تەرک کردنی سیاسەت لەزهنی بەعزێک مسوڵمان هەڵەیەکی ستراتیجیە کە هەر کارێک بێ نەتیجە دەکا هەڵبەتە کاتێ باسی سیاسەت دەکەم مەبەستم حزبایەتی نیە چونکە حزبایەتی بەشێکی بچوکی سیاسەتە ، ئەگەر حزب لەپێگەی سیاسی وڵات دەستی نەبوو

ئەوا ئەو حزبە تەنیا جوانکاریەکە بەدەست حزبی دەسەڵات بۆ جوان نیشاندانی پڕۆسەی دیموکراسی..

## پوختەی چلونۆ

سیاسەت ، دەعوە ، تەزکیە

کارکردنم لەناو ئیسلام بۆ ئیسلام لەمەرحەلەی ئیعداد دابەش کردووەتە سەر سێ بەش (تەزکیە ، دەعوە ، سیاسەت) هەڵبەتە سیاسەت بەمانای حزبی ; ئەم سێیانە بەپێی مەرحەلە لەگەڵ یەکتر یان بەجیا بەکار دەهێنرێن ، بۆ نمونە مەرحەلەی وا هەیە تەنها دەبێ خەریکی تەزکیە بیت ، مەرحەلەی وا هەیە دەبێ تەزکیەو دەعوە بکەی وە مەرحەلەی واهەیە هەر سێکیان

بەڵام لەهیچ کاتێ نابێ سیاسەت بەتەنها بکەی ... ئەو کاتە سیاسەت حەڕام دەبێ کە خەلەلی لە دەعوە و تەزکیە دروست کرد.

# کۆتایی

لەکۆتایی دەڵێم تاخیر بوون لە مسوڵمان بوون رێگر نیە بۆ پێش کەوتن لەخێر بۆ نمونە (سهیل ی کوڕی عەمر و عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل) ئەو دوو پیاوە بوون تا کۆتا دەقەی فەتحی مەککە شمشێریان وەشاند دژی پێغەمبەر ...بەڵام دوای مسوڵمان بوونیان تەواوی توانای خۆیان بەخشی تاکو خۆیان کرد قوربانی ئیسلام ...

عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل : لە شەڕی یەرموک بەرانبەر ڕۆمەکان ، ڕۆمەکان لە چەک و ژمارەی سەرباز زۆر لەپێش مسوڵمانان بوون بۆیە مسوڵمانان توشی زێقەتی بوون لەم شەڕە ئەمە بوو عیکریمە وتی کێ هەیە پەیمانم پێ بدا لەسەر مردن بۆ شکاندنی ریزی ڕۆمەکان ، خالیدی کوڕی وەلید وتی ئەی عیکریمە ئەمە مەکە لەئێستا بوونت باشترە لەناو جەنگاوەران ، عیکریمە وتی ئەی خالد تۆ پێشینەی خێرت هەیە لەگەڵ پێغەمبەر ئەی من چی ، لێم گەڕێ با تۆڵەی خراپەکانم بکەمەوە ، بۆیە عیکریمە بەو جوامێریە هەڵسا و گورزێکی لە ریزی سەربازانی ڕۆم دا دواتر شەهید بوو .

سهیل کوڕی عەمر : دوای وەفاتی پێغەمبەر ، هەڵگەڕاوەکان لەبن دیواری کەعبە کۆبونەوە خیطابیان بۆ خەڵکی دا لەوکاتە سهیل بەگڕو تینێکەوە وتارێکی پێشکەش کرد خەڵکی گەرم کردەوە لەسەر ئیسلام ، دواتر لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان کاتێ خەبەری شەهید بوونی کوڕەکەی پێدرا وتی ئەوا کوڕەکەم بۆ خۆدا ڕۆیشت ئەی ئێمە چی بۆیە بڕیاریدا بچێتە جیهاد ، لەیەرموک بەژداری کرد دوای فەتحی شام گەڕاوە مەدینە ، پاشان لەو تەمەنە گەورەیە بڕیاری دا بچێتەوە شام بەشداری جیهاد بکا بەڵام دوای بڵاوبونەوە طاعون ئەو نەخۆشیە دەگرێ و وەفات دەکا

..

ربنا إننا سمعنا مناديا ينادي للإيمان أن آمنوا بربكم فآمنا ربنا فاغفر لنا ذنوبنا وكفر عنا سيئاتنا " وتوفنا مع الأبرار

خاوەنەکەمان بیسەری بانگێشت بووین بۆ باوەڕهێنان , باوەڕبوون بە خاوەندارێتی تۆ , باوەڕمان " هێنا , خاوەنەکەمان لەگوناحەکانمان خۆش ببە وەگوناحەکانمان داپۆشە وە بمانگەیەنە بەپیاو چاکان

ربنا اغفر لي ولوالدي وللمؤمنين يوم يقوم الحساب" خاوەنەکەمان لەگوناحی من و دایک و " باوکم و مسوڵمانان خۆش ببە

. خودای بەرز هەیدایەتمان بدە وە هێزمان لەسەر هیدایەت پێ ببەخشە

پەنامان بدە لەعەزابی خۆت ... ئیمانمان سەلامەت بکە

.ربنا وتقبل دعاء خاوەنەکەمان دوعاکانم گیرا بکە

# بەرگی کتێب و کۆتایی

{ ئێمە ئەرک ناخەینە سەر خەڵک تاکو ئەرکی خۆمانیان بەرانمبەر جێبەجێ نەکەین }

"سەرنج بدەن و تەماشا بکەن بزانن زۆرترین تیری دوژمن بەرەو کێ دەڕوا حەق لای ئەوە"

"دەوڵەتی ئیسلامی بریتی نیە لەنمایش کردنی جێبەجێ کردنی چەند حوکمێکی ئیسلامی "


نووسەر:

نزار حاجی